زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (٩٥٤)
سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

www.sardem.org

■ بە سێبەری کێوی قافەوە

نووسین: کەریم کاکە

دیزاینی ناوەوە: شەماڵ وەلی

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ: ٢٥٠٠ دینار

چاپی: یەکەم، چاپخانەی سەردەم ساڵی ٢٠٢٠ کوردستان- سلێمانی

■ لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٨٤٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە

کەریم کاکە

# بە سێبەری کێوی قافەوە

گەشتنامە

سلێمانی - ٢٠٢٠

## بەسەر هەورەوە

زۆر شەو خەونم بە هەورەوە دیتووە، دەستم بە باوە گرتووە و لەسەر هەوری تێکەڵ بە زەردەپەڕ پیاسەم کردووە، هەر جارێکیش بەئاگا دەهاتمەوە، هەناسەی سارد ساردم هەڵدەکێشا، هەناسەیەک بە بەرچاومەوە دەبووە پەڵەهەورێکی سپی، دەمدیت، دەتگوت دووکەڵی جگەرەیە لە پەنجەرەوە ڕێی ئاسمانی دەگرێتە بەر و تەنک تەنک هەڵدەکشێ.

ڕەنگبێ هەناسەکەیش هەر درێژکراوەی خەونە هەورییەکە بووبێ، ئۆخەیش، نەمردم و خەون هاتە دی، هەوکە وا بەسەر هەورەوەم، هەوری سپی، لە پەزیی نزیک ئاقاری کوێستانی، کوێستانی کێلەشینی سپیتر.

چاو بدەنێ، لەو شوانە دەچم لەسەر تیشە شاخێکی سەر هەڵدێرێکی قەندیلی و قافانە دانیشتبێت و مێگەلە مەڕەکەیشی لە لەوەڕگەی خوارەوە بلەوەڕێن، تەنێ شمشاڵم کەم بوو، خۆ دەمویست شمشاڵ لەگەڵ خۆم ببەم، بەڵام بیستم:

ڕێ نادەن شمشاڵ بگاتە سەر هەوری.

ئەری لە دیدی ئێوەیشەوە هەور لە مێگەلە مەڕ دەچێ، کاتێ ڕووەو کوێستانێ دەچێ؟

لەو ساتەی خۆم دیت بەسەر هەورەوە، گوتەیەکی باپیرمم بیر کەوتەوە:

کاتێ هەورم لە بن خۆمەوە دیت، گوتم: خودایە، بەسە، لەوە پتر لە خۆتم نزیک مەکەوە، بەرگەی هەناسەت ناگرم.

دەمویست قسەکەی باپیرم بۆ برادەرەکەم بگێڕمەوە، هەستم کرد بە ڕادەیەک مەستی هەور بووە، ئەگەر قاڵە مەڕەیش لە بن گوێی شمشاڵ بژەنێ، نایبیستێ.

باپیری من بەر لە چل ساڵێ لەو بە ئاسمان کەوتنەی من، کە تەمەنی سەدەیەک دەبوو، ئاودیویشی کردبوو، سەردانەکەی خۆی بۆ سەر هەور دەگێڕایەوە، خۆیشی نەیدەزانی سەردانەکەی لە تەمەنی چەند ساڵیدا بووە، بەڵام دەیگۆ:

یەکەم فڕۆکەی حاجییان کە لە بەغداوە هەڵفڕیی و لە بن حەجێ نیشتەوە، منی تێدا بووم.

باپیرم دەیگۆ:

خوا لەسەر سەرانە، چ هەستم بە لە زەوی بوونەوە و فڕین و بە ئاسمان کەوتن، نەکرد، نە تەکانێک، نە لەرینەوەیەک، نە هیچ.

بەڵام ئەز ئاگام لە فڕینەکە بوو، هەر پێیم لە زەوی بووەوە، هەستم بە ئاسمان کرد.

باپیرم دەیگۆ:

بەوە زانیم لە ئاسمانم، بە برادەرەکەم گوت: ڕێم بکە تا نەفڕیوین، بچمە دەرێ و جگەرەیەک بکێشم.

ڕێی نەکردم، پەردەکەی لا دا و گوتی:

فەرموو برۆ دەرێ.

باپیرم لەسەری خۆی دابوو، خۆی لەسەر هەوری دیتبووەوە.

بەڵام من بەرلەوەی بگەمە سەر هەورێ، گەلەک شتم دیت، ئاخر من چاوم بە میناکەوە نابوو.

نازانم باپیرم، بەڵام من لە تەمەنی پەنجا ساڵی بەسەر هەور کەوتم و چوومە ئاسمانێ، باپیرم لە بیابان لە خزمەتی خۆشەویستیی موسڵمانان نیشتبووەوە، ئەز چیا و چیا ڕۆیشتم، گەیشتمە کێوی قاف، لە شاری یاجووج و ماجووج، شاری ئیبلیس! نیشتمەوە.

زۆر کەس دەیانگوت:

فڕۆکە سامی هەیە، جاری یەکەم ترس دەنیشێتە دڵەوە و هەرچی بکەیت ناڕەوێتەوە.

ترس نەیوێرا لە من نزیک بکەوێتەوە، یان ئەوەم نەدەهێنا بە لامدا بێ، ڕەنگە وای زانیبێ چەند پێکێکم هەڵداوە، بەڵام نا هیچم هەڵنەدابوو، ڕاستی هەر وام دەزانی سواری پاسم، لە لای قەڵاتەوە دەچمە عەنکاوە، خۆ لە ڕێی چەند جارێ وەک بڵێی تەکانی دەدا، تاسەی دەکرد، ڕێک دەتگوت لەو تاسانە دەدات کە لە جادان، بە نەخاسمە لە بەردەم ماڵە بەرپرسان هەڵنراون، باشە باپیرم دەیگوت:

فڕۆکە دەنگی نییە.

ئەدی ئەو فڕۆکەی ئێمە ئەو گرەگڕ و هووشەهووشەی لە چییە؟ گوتمە برادەرەکەم (هاوڕێی سەر هەورێ)، لێرەوە بۆ یادی باپیرم بە هاوڕێی سەر هەورێ ناوی دێنم:

ئەرێ ئێمە سواری جەنجەڕ بووین، یان فڕۆکە؟

هاوڕێی سەری هەورێ تێر پێکەنی و گوتی:

دەی هەچەی لێ بکە، هەور گێرە دەکەین.

گوتی:

من پێشتر سواری فڕۆکە بوومە، ئەوها نەبووە، ڕەنگە ئەوە کەچەترین فڕۆکەی دنیایێ بێ.

هەور لە سەرەوە ئەو هەورە نەبوو کە لە بنەوە تەماشام دەکــرد، لە بــنەوە جــوانتر و بەنــازترە، بەڵام لە ســـەرەوە جادوویی و پڕ ڕازترە، سروشت ئەو سروشتە نەبوو، کە لە نــاویەوە، لە دەشـــتەکانەوە، لە بڵنــدایی چیاکــانەوە لێــیم دەڕوانــی، لە نــاویەوە بە شــنەی ئارامیــت دەســپێرێ، بەڵام سروشت لە ئاسمانەوە بە سەرسووڕمانیت هەڵدەپەسێرێ، من وا بووم، چاوی من وا بوو.

بێ کالەی ئاسنین بەسەر کێوی قاف کەوتم، ڕۆژ لەسەر ئاوابوونە، ڕەنگی دنیا چ ڕەنگە؟ ئەگەر خۆم منداڵ بکەمەوە، دەڵێم ڕەنگی ئەوانی دی و خەزێمە و بەیبوونە، دێتە بیرم بە منداڵی لە بەهاری دۆڵی دڵۆپەی بن هەولێرێ لە هەر گوڵەی گوڵێکم دەچنی، بەڵام لە گوڵی خەزێمە و حاجیلە (بەیبوون) چەنــد گوڵێــک، چەپکەگــوڵێکی ڕەنگاوڕەنــگ دەردەچــوو کە ڕەنگــی حــاجیلە و خەزێمەی تێدا زاڵ بوون، ئەو ئێــوارەیە کەمێــک لەو چەپکەگــوڵە منــداڵییە دەچــوو، جیــاوازییەکە لە دیدی عەردی و ئاسمانییەوەیە.

## نیشتنەوە لە چراخان

نیشتینەوە، زوو نیشتینەوە، سەعاتێک و حەڤدە خولەک لە ئاسمانماینەوە، هاتینەوە سەر زەوی، حەزم دەکرد پتر زۆر پتر بە ئاسمانەوە بم، من ئەگەر بمەوێت کەسێکی وەک خۆم بکەمە کەسایەتییەکی ناو چیرۆک، ڕەنگبێ ئاوا نیشتنەوەکە بخەمە ڕستەوە:

ئەز پەنجا ساڵە لەسەر زەویم، ڕەنگی زەویم لێ نیشتووە، ماندووم، زۆر ماندوو، زەوی ماندووی کردووم، با بە ئاسمانەوە بم، هیچ نەبێ حەفتەیەک لە ئاسمان بمێنمەوە، لە ئاسمان بحەسێمەوە، تۆز و گەردی ماندوویەتیی زەوی لە ئاسمان نەبێ، ناتەکێ، لێم نابێتەوە.

ئیدی هاتینەوە زەوی، کوێی زەوی؟ زێدی یاجووج و ماجووج! دامێنی ڕووناهیی لێڕژاوی کێوی قاف.

ئێرەی زەوی چراخانێکە، دەڵێی هەزار هەیڤی لێ هەڵاتووە، پێدەچوو ڕووناکییەکە لەسەر سینەی ژنانی ئەوێ تیشک بداتەوە، ئەرێ ئەو هەموو ژنە هەیڤە لە کوێوە هەڵهاتن!

ئێرە فڕگەیە، لە قاوشی چاوەڕوانی بە دوای ژنێکدا دەگەڕێین، بیبینم دەیناسمەوە، پێشتر وێنەی ویم دیبوو،

دەڵێن ناوی بیلایە، بەڵام بۆ یادی ڕابەیەک حەز دەکەم بە دادە ڕابی ناوی بێنم، ئاخر وێنەکەی زۆر بەو ڕابەیە دەچێ کە لە یادەوەریی من لا ناچێ، ئەو ڕابەیە هێند سەربەست بوو، گەڕەک بەرگەی نەگرت، کوڵان کوڵان ناو و ناتورەی بە دوا خست، جۆگە جۆگە، جۆگەی چڵکاوی، قسەی پیسیان بۆ هەڵبەست، ئێ، لە ڕابەی بەری، ڕابەی گەڕەک گەڕێ.

دەبێ ڕابەی ناو فرگە ببینینەوە، تەلەفۆنی بۆ دەکەم، نارِوات، ڕەنگە کیشەیەک لە تۆڕی پەیوەندیدا هەبێ، دەگەڕێین و ژن ژن، تەماشای ژنان دەکەم، لەو چراخانە ژنەکان چەند لێکدی دەچن، لە هەر تەماشاکردنی، ژنێک لەو ژنانە لە من دەبێتە ڕابە، بەڵام کاتێ زار هەڵدێنم گازی بکەم، دەبێتەوە خۆی.

نابینم، ژنی ناو وێنەکە نابینم، یان دەیبینم و نایناسمەوە، ئاخر ڕەنگە بۆ من ئاسان نەبێت، لە ڕێی وێنەکەیەوە ژنێک بناسمەوە، کێ دەڵێ لە ڕابە دەچێ؟

نایبینمەوە، نایناسمەوە، هەرچەندە دوێنێ، ئا دوێنێ بوو، زۆر لە وێنەکەی ورد بوومەوە، کابراکەیش گوتی:

ئەوە وێنەی تازەیەتی، هەر هەفتەیەک دەبێت بە کامێرای خۆم گرتوومە، جوان تەماشای بکە، ڕێک ئەو وێنەیە دێتە لات، پرچی هەر بەو شێوەیەیە، دوور نییە هەمان جلکیشی لە بەر بێت.

گوتم:

لەو ژنانە نییە کە کەس دوو جار بە یەک جلکەوە نایانبینێت؟

گوتی:

نا، نا، ڕەنگە بە هەمووی دوو سێ دەستە جلکی هەبێت.

ڕاستی من لە وێنە باش خەڵک ناناسمەوە، زۆر کەڕەت کە تەماشای وێنەی دۆستان دەکەم، لە چاوی منەوە زۆر وێنە ناچنەوە سەر خاوەنەکانیان، کەچی وایش نییە.

بە هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێم:

تۆ لە کن پیاوی کۆمپانیاکە تەماشای وێنەی ژنەکەت نەکرد؟

دەڵێ:

هەر ئەوەتا چاوم کەوتە سەری، بەڵام ببینم، ڕەنگە بیناسمەوە.

درەنگە، لێرە نەمێنینەوە! بەردەوام چاو دەگێڕم و ژمارەکەیش لێ دەدەم، ئێ، ڕۆیشت، هەڵی گرت، بە کرمانجییەکی ناسک گوتی:

ئێوە لە کوێن؟ لە دواتان دەگەڕێم.

گوتم:

لە بەردەم سیمکارتفرۆشەکە.

گوتی:

ڕاوەستن، هاتم، سیمکارتیش مەکڕن، گرانە.

من کڕیبووم، ژنێک لە دوورەوە پێدەکەنی، لە پێکەنینیش لە ڕابەی گەڕەکێ دەچوو، ئەو ئێمەی لە وێنەیش نەدیتبوو ناسیمانی، کەچی من تا تەواو لە خۆی ورد نەبوومەوە وێنەکەیم نەناسییەوە! ئێستا هەست دەکەم خۆی لە ڕابە دەچێ، نەک وێنەکەی!

هێند بە گەرمی بەخێرهاتنی کردین، هێند توند دەستی گوشیین، دەروازەی شار بۆ من بووە دەرگای حەوشەی ماڵی خۆمان، ئیدی دادە ڕابی چاوساغمانە.

هەندێ پارەی بەڕکمان کردە لاری، لاری ناوێکی ناسکە چ لە ناوی پارە ناچێ، لای من لاری ناسکترین ناوی پارەیە، ئەها: دینار، تومەن، ڕیال، دۆلار، پاوەن، یۆرۆ... هەرچی ناوی دراوە بە دوای یەکدا ڕیزی بکە، ناو هەیە لە لاری ناسکتر؟ لاری وەک بڵێی لەنجەولاری تێدایە، خۆی با دەدات، نازێ دەکات، شێوەیەک لە برژانگی دادە ڕابیی تێدایە.

دادە ڕابی شوفێری تەکسییەکی لەگەڵە، پێی ناساندین:

ئەو ئیدواردی ئەرمەنی، بەڵام من بە ئیدۆ بانگی دەکەم.

ئیدی لای ئێمەیش بووە ئیدۆ، ئەو ئیدۆیە، دەڵێی لە ماڵی کۆمیدیا پەروەردە بووە، هەموو گیانی پێکەنیناوییە، تۆ کە لەگەڵی سوار دەبیت، دیارە لە زمانەکەی تێناگەیت، بەڵام حەز دەکەیت تا ئەوسەری دنیا لەگەڵی بڕۆیت و لە ترومبێلە شڕەکەی دانەبەزیت.

دادە ڕابیی چاوساغ دەڵێ:

چ دەڵێن، میوانخانە یان بازاڕ؟

هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

نە حەسانەوە، نە خەو، گەڕان، گەڕان، هەمیشە گەڕان.

وا دیارە فرۆکەخانە زۆر دووری شارە، تاریکایی داهاتووە، جامەکەم کەمێک داکشاند، بایەکە ساردە، بایەک دەڵێی لە کوێستانی کێلەشینەوە هەڵی کردووە، دێتە بیرم پێش نازانم چەند ساڵ، ئەو دەمەوئێوارەیەی پێم خستە ئاقاری کێلەشینەوە، ڕێک ئەو بایە بەسەر و ڕیشمدا هەڵگژا...

## شارێ لە شێوەی دوو کەرتەسێو

گەیشتینە ناو تونێلێ، دادە ڕابی دەڵێ:
درێژترین تونێلی شارە، (...) خولەکە ڕێیە، ئەو ڕێوبان و ناوە، ڕۆستاڤیلیی ناوە.
بیرم نییە خولەکێ یان سێی گۆ.
گوتم:
ڕۆستاڤیلی شاعیرەکە نییە؟
گوتی:
با، خاوەنی داستانەشیعری سوارێک بە بەرگی پڵنگەوە.
من کەم شتێ لەمەڕ ئەو شاعیرە و سوارەکەوە دەزانم، دڵم بەوە خۆش بوو، ناوی یەکەم جێ کە بیستم، بە ناوی شاعیرێکەوە بێ.
ئێستا ڕەنگە کاتی بانگدان بێ، بانگی نوێژی شێوان بێ، دوێنێ ئەو دەمە، نا، درەنگتر، نا، زووتر، لێم تێک چوو، لە چ کاتێ هەولێر و تبلیس ڕۆژیان لێ ئاوا دەبێ! نازانم، ئا دوێنێ ئەو دەمە چەند سەد مەلا پێکەوە بانگیان دەدا، بەڵام لێرە دەنگی مەلایەکیش نایە، ئەوە یەکەم شارە بێمە دیداری و لە دەمی بانگدانێ دەنگی مەلا و ئەللاهوئەکبەری لێ نەیە.
ئەو شەقامە وەک دادە ڕابی گوتی:
ناوجەرگەی شارە.

ئێرە شاری تبلیسە، پێتەختی وڵاتی گورجستانە، چراخانە، وەرز هاوینە، مانگ گەلاوێژە، بەڵام هەوا فێنکە دەڵێی بەرایی بەهارە، لە ناوهێنانی ساڵ دەترسم، دەزانی چەند خێرا دەڕوا، خێراتر لەو ڕووبارەی تبلیس دەکاتە دوو کەرتی جوان، هەر دەڵێی سێوە و دوو کەرت کراوە، ئەری کاتێ چاوساغێ مە گوتێ:

ڕووباری کورا لە دوورەوە دێ، ئەها لێرەوە تبلیس کەرت دەکا، ڕووبارێکە لە دەچلەی خۆمان جوانتر نازێ دەکات.

بۆچی تبلیس لە دیدی مندا لە شێوەی سێوێکی سوور خۆی نمایش کرد، بۆنی سێوییشی لێ دەهات؟

ئەوشۆ تبلیس لە من سێوە، سێوی پڕ سێوە!

پرسیی:

حەزتان لە چ خواردنێکە؟

من خەجەپووریم بیستبوو، گوتم:

خەجەپووری.

گوتی:

ناودارترین خواردنی ئێرەیە، هەر کەسێک بێت و خەجەپووری بە گەرمی نەخوات و لە نزیکەوە دایک نەبینێت، ئەوە گورجستانی نەدیتووە.

کچێک خەجەپووریی لە پێش دانام، ئەگەر سوور زانیبام ژەهریشی تێکردووە، دەمخوارد، ئەوە چییە خودایە! هەرچی جوانیی ژنی دنیایە لەو کچە دایە، لەوێ باوەڕم بەو چیرۆکە هێنا کە پێشتر بیستبووم و دوایی دەیگێڕمەوە.

ئیدۆ ئەرمەنی، دیار بوو هەستی کرد دەستم لەسەر خەجەپووری، بەڵام چاوم لەسەر کچەیە، قسەیەکی بە

نەرمی هاویشت، هەستم کرد لە منی گرت، دادە رابی بە پێکەنینەوە گوتی:

دەست بە تەماشاکردنەوە بگرە، لەو شارە جوان زۆرن و زۆر لەوە جوانتریشی تێدایە.

شەوە، بە ناو تبلیسدا دەسووڕێینەوە، ترومبێلەکەی ئیدۆ ناوە ناوە ڕادەوەستێ، بەڵام دادە ڕابی لە قسە ناکەوێ، لەبارەی هەموو شتێکی تبلیسەوە دەدوێ، مێژووی تبلیس شەقام شەقام، کۆڵان کۆڵان، کڵێسە کڵێسە، دەگێڕێتەوە، ناوە ناوەیش ئیدۆ قسەیەک دەکات، دادە ڕابی لە پێکەنین لەسەر پشت دەکەوێت و ئێمە سەرەتا بە پێکەنینیەکەی دادە ڕابی پێدەکەنین، بەڵام کاتێ پێکەنین دەوەستێ و قسەکەی ئیدۆ دەکاتە کوردی، پێکەنینی ئێمە لێرەوە دەست پێ دەکات، خۆ هاوڕێی سەر هەورێ هەر ڕاناوەستێ، پێکەنین لە پێکەنین گرێ دەداتەوە، دادە ڕابی دەڵێ:

چیدی قسەی ئیدۆتان بۆ وەرناگێڕم، چونکی کاتەکەمان هەر بەشی پێکەنین دەکات.

ئیدۆ هەر قسە نا، هەموو گیانی پێکەنیناوییە، چۆنیەتیی سووکانگرتنی، ئاوڕدانەوەی، دەمکردنەوە و چاوداخستن و برۆهەڵتەکاندنی، هەشبەسەر دەهێنێتە پێکەنینی.

وازی لە وەرگێڕان هێنا و درێژەی بە گێرانەوەی تبلیس دا، ئەو ژنە لە قسان دەتگوت ڕووبارە، پێل پێل سەرهاتی ناسکیی ڕووباری کوڕای گێڕایەوە و خشتەکانی کۆنترین کڵێسەی دنیای گێڕایەوە، پێکەوەیی عیسایی و مووسایی و محەمەدی گێڕایەوە، ئازایی و میهرەبانیی دایکی گورجستانی گێڕایەوە، بازاڕی ژوان و دیداری گێڕایەوە، ئەفسانەی ئەشکەوتی گێڕایەوە، بەدەم گێڕانەوە گەیشتینە میوانخانە،

توانیم ناوەکەی بخوێنمەوە (بازەلیتا)، بە ڕێنووسی لاتینییش نووسرابوو، من هەر ئەو شەوە هەستم کرد لە گرفتێکی ئالۆزدام، ئەو ڕێنووسە نازانم کە زمانی ئەو شار و وڵاتەی پێ نووسراوەتەوە، ڕاستی گەشتەکەم بۆ گورجستان زۆر کتوپڕ بوو، دەنا خۆم فێری ڕێنووسەکەی دەکرد.

ئێمەی بە جێوری کرد و گوتی:

ئەو جێیانەی ئەوشو بۆم باس کردن، بە ڕۆژ دەتوانن سەردانیان بکەن.

لە ساتی ماڵاوایی ئیدۆ قسەیەکی کرد، دادە ڕابی گوتی:

من ئەو قسەیەتان بۆ وەرناگێڕم، پەیوەندیی بە منەوە نییە، بەڵام بە خۆی نەوستا و بە شەرمەوە:

دەڵێ، ژنیش هەیە.

ئیدۆ تێیکردمەوە، بە ئاماژە تێیگەیشتم دەیەوێت پیاوەتیمان لەگەڵ بکات، ئیدۆ کەمێک تورکیی دەزانی، منیش هەندێ وشە و دوو سێ ڕستەی تورکمانی، ئیدی باسوخواسەکە لەمەڕ خانومانە، بە ئاماژە سوپاسم کرد و هەر بە ئاماژە و بەهەندوەرنەگرتنەوە:

ئەگەر ویستمان ئاگادارت دەکەینەوە.

هەستم کرد، بە هەندوەرنەگرتنەکەی منی بەهەند وەرگرت و بە ئاماژە و پەیڤ کوڵی شتی گوت، هێندە تێگەیشتم:

سەیرە، پەرۆشی گەیشتن بە ژن نین!

لە دڵی خۆ گوتم:

وێدەچێ ئەو پیاوانەی لە وڵاتی مەوە ڕوو لێرە دەکەن، بەر لە هەر شتێ ژنیان دەوێ.

## گەڕیدەی دیرۆکی

بازەلیتا میوانخانەیەکی دوونهۆمیی گەورەیە، وا دیارە لەبەر هەرزانیی ئیمەیان هەڵداوەتە ئەو ئاقارە، لاچەپ کەوتووە، نە لەسەر ڕووبارە، نە نزیک بازاڕە، بەڵام جیگاکە خۆشە، جا وەک دواتر دیتم، لە تبلیس جییەک هەیە ناخۆش؟ گەراج و ئاودەستەکانی لیَ دەربچیَ.

ماڵنوستنانە، خەوم نەهات، چووم لە لای ئیشککگرەکە نهینیی تۆڕم وەرگرت، لاپتۆپەکەم هەڵکرد و لە دامینی چیای قافەوە چوومە ناو دنیا، بە شەو باشیَ پیوەندیم بە سیَ چوار برادەرەوە کرد، هەر یەکەی لە شار و ولاتیَ، لەویَ گرفتی ناو سەربردەی گەڕیدەیەکم بیر کەوتەوە:

لە دوادوایی سەدەی نۆزدە، ڕیی دەکەویتە ئەو تبلیسە، لە میوانخانەییَ دادەبەزیَ، ناوی میوانخانەکەم لە یاد نەبوو، دەنا دەمپرسی و دوور نەبوو ببیینمەوە، ئاخر وەک بیستم لە تبلیس میوانخانە هەیە، تەمەنی لە سەرووی تەمەنی نووحەوەیە.

ئیَ، گرفتی گەڕیدە ئاگادارکردنەوەی کەسوکارە لەوەی کە نەکەوتووەتە دەستی دز و جەردان، گەڕیدە نامەیەک دەنووسیت، بەڵام وەک خۆی دەڵیت:

تا دەگاتە جێ، داخوا چەند حەفتە و مانگی پێ دەچێ.

کەچی من ئەوەتا لەگەڵ کوڕەکەم لە نێوان هەولێر و تبلیس وشە و دەنگ و وێنە دەگۆڕینەوە، تۆ تەماشاکە دنیا لە سەدەیەکدا چ گۆڕانێکی خەیاڵیی بەسەردا هاتووە.

گەڕیدەکەی پێش سەد و هێندە ساڵە، گەشتیارەکەی زەمانی پێشان، بۆ ناسینی تبلیس، بۆ زانینی ناوی جێیەکی ئەو شارە، دەبوو بپرسێ، زۆر بپرسێ، یان هەوڵدا بە بیر خۆی بهێنێتەوە لە چ کتێبێک چەند دێڕێکی لەبارەوە نووسراوە، کەچی من لە هۆدەکەم لەسەر مێزێک، لە ناو شاشەیەکی لاکێشەیی کە هەر بەقەد کتێبێکی پەڕ زەردی سەردەمی گەڕیدەکە دەبێت، مام گووگڵ یان پلکە گووگڵی گەڕیدەی دنیادیتەی هەمووشتزان بەرانبەرمە، بە جووڵەی پەنجەیەک، هەرچیی لێ دەپرسم لە چەند چرکەیەک وەڵام دەداتەوە، چیم دەوێ، نیشانم دەدات.

بەرلەوەی بچمە خزمەتی گووگڵی لە وەڵام تەڕدەست و پرسیارکوتی بکەم، چوومە جادە، ویستم لە شوفێری تەکسییەک کە لە پێش دەرگای مێوانخانە ڕاوەستابوو، بپرسم مەیفرۆش لەو نزیکانە هەیە، نەمزانی چ بڵێم، هاتە بیرم کە وشەی بیرە ڕەنگە جیهانی بێ، گوتم:

بیرە، بیرە.

بە ئاماژەی دەستیش دەمگوت:

کەوتووەتە کام لا؟

تێنەگەیشت، هاتەوە بیرم کە سێ وشەی ڕووسی دەزانم، یەکیان لێرە بە کەڵکم دێ، کە بیرەیە، گوتم:

لۆدی، لۆدی.

لەگەڵی زمانی ئاماژەیشم بە کار هێنا، تێگەیشت، نیشانی دام، نزیک بوو، سێ بیرەی ڕووسیم هێنا، ناو و تامی خۆش بوو، بەدەم هەڵدانی بیرەی تەزی، چوومە دیداری گووگڵ، لەو شەوە لەبارەی تبلیسەوە، ڕووباریٚ پرسیارم لێ کرد، بیرمە پرسیم:

ڕووباری کورا لە کوێوە بۆ کوێ؟

گووگڵی دنیادیتە بە عەرەبی دەڵێ:

لە چیاکانی قەفقازەوە بۆ دەریای قەزوێن.

دەڵێم:

لەگەڵ چ ڕووبارێک تێک دەکاتەوە؟

دەڵێ:

ئاراس.

پرسیم:

مەبەستت ئاراسە؟

ئاراسەکەم بە کوردی نووسی، گرگر، مێشکی خۆی گەڕا، وەڵامی نەدیتەوە، دەمویست مام و پلکە گووگڵێکی کوردیزان ببینمەوە، خەو بردمیەوە.

ڕۆژ هەڵاتووە، لە چێشتخانەی مێوانخانە وا لەسەر تێشتین، لەو سبەینییە ئەو شتەیشم خوارد کە شێوەی کتومت نانەقەیسییە، نەمزانی ناوی چییە، بۆیە ناوم نا نانەبەراز، گۆتمە هاوڕێی سەر هەوری:

بەراز لە بەرخ بەتامترە.

وابزانم لەو ساتە چاوی لەسەر نازدارێکی گەردنکێل ڕاگرتبوو، گوتی:

لێرە کەستەکیش بەتامە.

چێشتخانە پڕە لە پیرە جوو، جاحیلەکەیان حەفتا ساڵ سەرترە، بە زمان نا، بە کڵاوەکانیان ناسیمنەوە، پیرێژنێکیان زۆر لە ناجیە بن جوو دەچوو، دڵنیام، ئەگەر خوشکی نەبێ، دۆتمام یان پلکزایەتی، گۆتمە هاوڕێی سەر هەوری:

دەڵێی ئەو ژنە دەناسم.

گوتی:

لە هەندێ سات پیرێژنەکان بە یەک دەچن.

هاتە سەرم بچمە کنی و بە کوردی لێی بپرسم:

ئەرێ لە هەولێرێ لە گەڕەکی جوو خوشکێکت بە جێ نەهێشتووە؟

دادە ڕابی پرسیاری لە بیر بردمەوە، لە تەلەفۆنەوە:

ئەورۆ سەردانی کوێ دەکەن؟

بڵێم کوێ؟ دڵم هەموو جێی دەوێ، دەڵێم با لە کۆنترین جێوە پێدا بێین.

## کیژی ناو شیعر

ڕێک کەوتین لە کۆنترین کلێسەوە دەست پێ بکەین، ئەرمەنییەکە نا، جۆرجییەک هات، باژۆ.

تبلیس بە ڕۆژ لە شەو جوانتر دەدرەوشێتەوە، لە دیدی منەوە تبلیس درەخت، خشت خشت، دەدرەوشێتەوە، لە ڕێی، لەجێ جێ نزیک ڕووبار دەبینەوە، لە پرد دەپەڕینەوە، ڕەنگی ڕووبار بەلای کەسکیدا دەشکێتەوە، چاو وریا نەبێت بە هەڵەدا دەچێ، لە ڕەنگی سروشتی دووری دەخاتەوە بەلای ڕەنگی قەوزەیی و پیسبووندا دەیباتەوە، ڕووباریش دەدرەوشێتەوە.

ئەو هەموو ئەسپسوارە چییە دێنە ڕێت، هەندێ لە ئەسپەکان هەستاونەتە سەر پاشوو، لە چاویانڕا دیارە نیازی فڕینیان هەیە، سوار شمشێری بە شێوەیەک هەڵکێشاوە وەک بڵێی بیەوێ هەور شەق بکات، هەندێکی دی لەسەر چوار پەلە ڕاوەستاون و سواریش هەندێکیان لە شیریانڕا دیارە لە پشوون، هەیشیانە لە باری شەڕە و دیارە لە چۆنیەتیی وەستانی بەرزەوە تێدەگەین ئەو سوارە لە شەڕێ کوژراوە یان نا.

لە دڵی خۆ دەڵێم، دیرۆکی ئێمەیش پڕە لە سوارچاک، خۆ دەکرێ هەولێریش هەندێ شەقامی بە پەیکەری ئەسپسوار، برازێتەوە.

تبلیس ولاخ و سوارەکانیشی دەدرەوشێنەوە، چاوم تژی بوو لە ڕووناهی.

لە شار دەرچووین، لەسەر گردێک خانوویەک دیارە، نیکۆلای شوفێر کە لەسەر زاری دادە ڕابی، ئێمەیش هەر بە نیکۆ بانگمان دەکرد، بە ئاماژە تێیگەیاندین:

ئەوێهی کڵێسە کۆنەکەیە.

وا تێبگەم پایتەختی کۆنی گورجستانیش، بەر لە تبلیس هەر لەو ناوە بووە.

تەواوێ دوورە، هەڵکشێ، چەند پێچێ هاتە پێشێ، گەیشتین.

تا ئێرە بۆ ئەوەی بزانین بە بەردەم چەند کڵێسە تێپەڕیین و لە چەندیان نزیک بووینەوە، دەبێت لە نیکۆ بپرسین:

ئەرێ کابرا، لە ئاست چەند کڵێسە هێواشت کردەوە، نیشانەی خاچت کێشا؟

من زمانەکەیم نەدەزانی، دەنا لێم دەپرسی، نیکۆ لەو ڕێیە، دەستێکی بە سووکانەوە، ئەوی دی لە خاچکێشان بوو، ئەو هەموو کڵێسە چ بوو هاتە ڕێ، زۆر بوون، بە سێسەد هێندەیش ببنەوە ناگەنە مزگەفتی ناو هەولێرێ.

کڵێسە بۆنی کۆنیی دنیای دەدا، بۆنێکی خۆش، بۆنێک نە بخوورە نە ڕێحانە نە هیچ بۆنێ، بۆنێکە تایبەت بە کۆنیی دنیا، ئێوە بۆنی کۆنیی دنیاتان کردوو؟

چاوم لە دەورو بەری خۆم گێڕا، ژماردم بە هیی هاوڕێی سەر هەورێوە حەفتا بخور داگیرسابوو، من کردمە حەفتاویەک، بەڵام بۆنی کۆنیی دنیا زاڵە، هەرچی گوڵاوی دنیا هەیە لێرە بیپژێنی، هەر کونیی دنیا زاڵە، کڵێسە خشت خشت گوڵاوی کۆنیی خۆی بە ڕووتدا دەپژێنێ، نیکۆ دوای وەی خشتوخۆڵی کڵێسەی ماچ کرد، دیار بوو مێژووەکەی دەگێڕایەوە، بەڵام بۆ کێ؟ خۆ ئێمە یەک ڕستەی تێناگەین، بەوەی باش بوو، شەو لە ڕێی پلکە گووگڵەوە شتێ لە دیرۆکی ئێرەم بیستبوو.

نیکۆیش تێگەیشت قسە بۆ دیوار دەکات، بەڵام لە قسان نەکەوت، وەک بڵێی دەیەوێ پارەکەی حەڵاڵ بکات.

لەوێ لە کۆنترین کڵێسەی گورجستان، لە دوای هەر میللەتێک بگەڕێی دەیبینییەوە، من لە ماوەی چەند جغارەخۆرێک، تورک و عارەب و فارس و ئینگلیز و ئەڵمانیم دیتەوە.

ئەو خەڵکە لەو بڵندایییەی دنیا، بە دەوری کڵێسەدا دەسووڕانەوە، قسەکانیشیان هێندەی من تێگەیشتم، هەمووی بە دەوری کۆنیی کڵێسەدا دەسووڕانەوە، لەوێ کەوتمە بارێکی وا، هەر قسەیەکم لەبارەی کۆنییەوە دەبیست، بۆ من دەبووە نەخشی سەر بەرد، باوەڕم پێ دەکرد و گومانی نەدەویست، پیاوێک لە زمانیڕا دیارە تارانییە، نزیک لە شێوازی بزورگی عەلەوی بۆ ژنەکەی قسە دەکات، چەند ڕستەیەکم لێی ژنەوت:

ئەو کڵێسەیە هیی سەردەمی عیسایە، تازە لەخاچدرابوو، هێشتا خوێنی لێوە دەچۆڕا، بەردی بناغەی ئەو کڵێسەیە دانرا.

ژنێک شێوەی زۆر لە فەیرۆز دەچوو، وا تێبگەم خەڵکی لوبنانیش بوو، بۆ کورەکەی دەدوا:

یـــاوەرێکی حەزرەتـــی عیســـا، لە چ جێـــیەک جێـــی نەدەبـووەوە، سـەری خـۆی هەڵگـرت، هـات هـات، گەیشـتە تبلیسێ، بە گەرمی بەخێرهاتنیـان کـرد، وەسـتایەکی دیتەوە، لەو سەر چیایە، ئەو ماڵە پیرۆزەی بونیاد نا.

ئینگلیسـێک قسـەی دەکـرد، لە هـاوڕێی سـەر هەورێـم پرسی:

ئەوە چ دەڵێ؟

گوتی:

چ دەڵێ! هەر کۆنیی کڵێسە نییە؟

بە دیـار کڵێسـەوە لەسـەر بەردێـک و پشـتم بە بەردێـک داوە، ڕەنـــگە ئەو بەردە بە دەســـتی وەســـتای هـــاوڕێی یاوەرەکەی عیسا لێرە دانرابێ و یـاوەر لەسـەری دانیشـتبێ، ئا دانیشتبوو، لەو قسانەوە من تەواو تێکەڵی کۆنیی کڵێسە و دنیا بووم، لە ئێستا و دنیای ئێستا دابڕام:

سوێندتان لەسـەرم نییە، دیتم یاوەرەکەی عیسـا، ڕدێنێکی خورمـــایی هەیە، لەســـەر بەردەکە هەســـتا، خشـــت دەداتە دەست وەستا.

نیکۆ بانگی نەکردبام، لە ماڵی خەیاڵ نەدەگەڕامەوە.

لە کۆنیی دنیا هاتینەوە خوارێ، پێشـەوەی بێینە خـوارێ، ئاوڕم لە سەگ و پیاوەکە دایەوە، ئەو دووە هێند کۆن دیـار بوون، دەتگوت تازە لە "ئەشکەوتەکە" هاتوونەتەوە، پیـاوەکە شـتێکی وەک پـووزەوانەی دەچنـی، سـەگەکەیش سـەری لەسەر ڕانی پیاوەکە، وەرکەوتبوو، زۆر ماندوو دیارە، پێ لە کلکی بنێی هێزی حەپەیەکی تێدا نەماوە.

چووینە کڵێسـەیەکی دی، شـەو لە گـووگڵم بیسـتبوو کە گەورەترین کڵێسـەیە، زۆر گەورەیە، لە ناو شـوورەیەکە بڵند زۆر بڵند، کڵێسـە هەزار کون و قوژبنی هەیە، لە گشت لاوە تریسکەی ئاگرە، بخورە، دەڵێی دەروازەی بەهەشتە، من لە هەولێر سەردانی کڵێسەم کردووە، ئەو وێنەی هیچیان نییە، ئەو کڵێسـەیە ئـۆخژن بەخشـە، حەزم دەکـرد ئەو ڕۆژە لە ناوی بمێنمەوە.

لە هـاتنە دەرێ، بەو دوو چـاوە مـانگم دی، دەهـاتە ژووریێ، کـچە مانـگ بـوو، لەو کـچەوە بـاوەڕم هێنـا ئەگەر کەسێ لە جوانترین بگەڕێ، لە گورجستان دەیبینێتەوە، دیتم مانـگ چەمیـیەوە، چـۆکی دادا، دەسـتەکانی گەیشـتە سـەر عەرد، لێـوی تریفەیـی گەیانـدە خـۆڵ، مـاچی کـرد، خـۆڵی کڵێسـەی مـاچ کـرد، خۆڵی بـن پێـی ئەو هەمـوو عیسـایی و ناعیسایییە، هەسـتم کرد خۆڵ بـووە مرواری، هـاوڕێی سـەر هەورێ گوتی:

ببینە، ئەو جوانە چیی کرد!

شیعرەکەی هێمنم بۆ خۆم خوێندەوە، کەسێ نەبـوو بـۆم بخاتە سەر زمانی کچە، دەنا بۆیم دەخوێندەوە:

دیم کچێکی لەباری لادێیی
بۆ نوێژ ڕادەخا بەرهەڵبێنێ
گوتم ئەی نازەنین کە ڕوخسارت
هەموو باخی بەهەشتی خودایی دێنێ
بۆچی پێت وایە ئەو خوا گەورە
هێندە بێرەحمە تۆیش بسووتێنێ

لەوێ بـووین زەنگـی کڵێســە لێـی دا، ئەو چێـژەی لەو کڵێسەیەم وەرگرت، باوەڕ ناکەم نە نیکۆ نە هیچ عیسـاییەک وەری گرتبێ.

## تیلمه تەرمكەی بەهەشت

لەوێوە بۆ سەر دەریاچەیەک، ئەویش هەر لە تبلیسە، لە کڵێسەوە تا دەریاچە هیچم نەدیت، پێدەچێ مەست بووبم، مەستی مەی؟ نا، بیرەیەکیشم نەخواردبووەوە، من مەستی کۆنی و جوانیی کڵێسەکان بووم، کۆنترین کڵێسە و گەورەترین کڵێسە، ڕەنگە لە ڕێ بۆرژابووبم، لەسەر دەریاچە چاوم کردەوە، هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

ئەوەیش بەهەشت.

ئای، دەڵێی گاڵتە ناکات، دیارە پێشەوەی بگەیتە بەهەشت، پێویستت بە سەرخەوشکاندنێک هەیە، من لە ناو ترومبێل لە تەنیشت نیکۆ سەرخەوەکەم شکاندبوو، نا، نابێ خەوتبم، من و لە ناو ترومبێل خەوتن!

لە دەریاچە چ ببینم! خودایە ئەوەی من دیتم گشت گەشتیارێک ببینێت، ناو دەریاچە و کەنارەکانی یەکپارچە ژنی ڕووت، هەرچی ڕەنگ و شێوەی لەشولاری ژن هەیە، لێرە ببینە، کام جۆری ڕاکشان و دانیشتن پتر جوانی دەداتەوە، لێی بڕوانە، لەسەر زگ، لەسەر پشت، تەنیشتاوتەنیشت، سەر چیچکان، سەر چۆک، لەسەر لایەکی سمت، قیت و قیت، ڕێ نییە بگەیتە ئاو، پیاو هەر چۆن پێ

داوێ، بەر سینگ و سمت و پەنجەی ڕۆچووی ناو لم دەکەوێ.

زوو خۆم ڕووت کردەوە، درەنگ گەیشتمە ناو ئاو، لەبەر ماسییە ژن جێ نییە بۆ مەلە، قوولایی دەریاچە هێندە پڕ ژن نییە، جێ جێ ئاو دیارە، بەلام من مەلەوانی قوولاییەکان نیم، دوایی بۆ بچمە قوولایی؟ خۆشییەکە لە تەنکاییە، لە ئاواییە، ئاواییەکی ژنانە، ئاواییەک دەبێت خۆت لە مەمکان لا بدەی، ئاخر مەمکی هێند درێژووکانی و قیتت بۆ دێ، ڕێک دەڵێی گوللەهاوەنە، دەڵێی ئێستا دڵت دەتەقێنێتەوە، سمتی وا لێت نزیک دەکەوێتەوە، دەڵێی ئێستا...

لە ناو ئاو و سەر کەنار زۆر مامەوە، لە بەهەشتی تبلیسی زۆر مامەوە، دەمدیت هاوڕێی سەر هەوری لەولا دوور لە جەرگەی بەهەشتێ، نازانم گەنمەشامی بوو، چی بوو، دەیخوارد، بە دەست ئاماژەم بۆی کرد بێتە بەهەشتێ، نەهات، وا دیارە بەدەم خواردنی بەهەشتییەوە، سەیرکردنی بەهەشت، چێژەکەی پترە لەوەی پێ بخەیتە ناوی.

بەرە بەرە چۆل دەبێ، دەڵێی وادەی سەردان، سەردانی بەهەشت تەواو بووە، بەلەموانێک لێم نزیک کەوتەوە، لەو بەهەشتە بەلەمی گچکە بە پارەیەکی کەم گەڕانی ناو دەریاچەیان بە خەڵک دەکرد، شتێکی لێم پرسی، بە ئاماژە تێمگەیاند کە تێنەگەیشتم، بە ئاماژە و وشە پرسییەوە:

تۆ تورکی؟

بە ئاماژە تێمگەیاند تورک نیم.

بە ئاماژە و دەنگ پرسیی:

کەواتە عەرەبی؟

گوتم:

من کوردم.

پێکەنیی و بە ئاماژە و دەنگ گوتی:

ئەها، کورد واتە کرمانج؟

گوتم:

بەڵێ.

بە ئینگلیزییەک هەر من زانیم ئینگلیزییە، پرسیی:

ئینگلیزیی دەزانی؟

بە ئاماژەی دەست گوتم:

چەند وشە و ڕستەیەک دەزانم.

ئـێ بە ئامـاژە و چەنـد وشـەیەکی ئینگلیـزی لەگەڵ ئەو کوڕە کەوتینە قسە.

گوتی:

لە گورجستان کورد زۆرە، بەڵام من لە ڕێی ئۆجەلانەوە کوردم ناسی.

گوتم:

ئۆجەلان سەرکردەیەکی دیارە.

گوتی:

ئیمراڵی نەیتوانی ئەو پیاوە بە چۆکدا بێنێ.

لەو ساتەدا دەمویست بانگی هـاوڕێی سـەر هەورێ بکەم کە شتێکی لە ئینگلیزی دەزانی، تا لەو قسانە یـارمەتیم بـدات، دیار نەبوو، ئەو کوڕە بە قسەی خۆی تازە ماستەری هێناوە لە جوگرافیـا، بەڵام بەلەمـوانییش دەکـات، تێنەگەیشـتم نە بـۆ خۆشیە، نە بۆ بژێویی ژیـان ئەو کـارە دەکـات، ئەو کـوڕە لە جوگرافیـا زۆر شــارەزا بــوو، نــاوی هەر دەریــایەک، هەر چیـایەکی نـاودار، هەر ڕووبارێـک، شـارێکم دەگـوت دەیزانـی

کەوتووەتە کوێی دنیا، دیجلە و فوراتم لێی پرسی، لە من و تۆ جوانتر دەیزانی لە کوێوە سەرچاوە دەگرن و سەر بە کوێدا دەکەن، گوتی:

لە کوردستانی ئۆجەلانەوە هەڵدەقوڵێن و...

بەلەموان زۆر سەرسام بوو بە ئۆجەلان، دنیایەک شتی لەبارەی ئەو پیاوەوە دەزانی، ڕقی دنیای لە تورک دەبووەوە، گوتم هەبێ و نەبێ ئەوە ئەرمەنە و کۆمەڵکوژیی ئەرمەنییەکانی لە بیر نەچووەتەوە، گۆتم:

تۆ ئەرمەنییت؟

گوتی:

نا، من جۆرجیم.

پرسیاری زنجیرە چیای قەفقاسیام لێی کرد، لە کوێوە دەگاتە کوێ؟ هاتە قسە، لەو قسانە بووین، دوو کچ، ئەوانەی هێشتا لە بەهەشت مابوونەوە، سواری بەلەمەکە بوون، کوڕە بەلەموان و ئۆجەلاننااس مالاوایی کرد، دوا قسەی، دیارە زانیی من مەلەوانییەکەم باش نییە، بە ئاماژە و دەنگ گوتی:

ئۆجەلان، لە قووڵایی نزیک مەکەوە دەخنکێی.

ئەو کوڕە منی بە ئۆجەلان بانگ کرد، ئاخر وەک لە قسەکانی تێگەیشتم، پێویستە هەموو کوردێک، ئۆجەلانی بێت، لە دڵی خۆم گوتم لە بەهەشتێش ئۆجەلان دێتە ناو قسانەوە.

لەسەر چەوی بەهەشت لەسەر پشت ڕاکشام، هەردوو دەستم خستە بن سەرم، دەبوو کەمێک سەرم بەرز بکەمەوە، تا حۆرییەکان ببینم، بیشتوانم دوو سێ بیرە هەڵدەم، لەو ساتە نیکۆ گەیشتە سەر سەرم، بە ئاماژە،

تێگەیشـتم دەمـێکە لە دوام دەگەڕێ، گـوایە لە بەرنـامەی ئـێمەدا مانەوەمـان لەسـەر ئەو دەریـاچەیە یەک دەمژمێـرە، بەڵام ئێمە دوو هێندە و نیوە لێرەین، بە کوردی گوتم:

کەس بەو کاتە کەمە لە بەهەشت تێر بووە؟!

بەر لە بەجێهێشتن، لە بەر خۆمەوە کەوتمە ورتەورت:

ئەگەر لە چاخی پێغەمبەران، جێیەکی وا هەبا، بەهەشت شـێوەیەکی دیـی وەردەگـرت و خەڵک پتـر خۆیـان بـۆی بە کوشت دەدا.

لەو بەهەشتە بڵندەیش، گۆمی بێکۆدیای سـەری قەندیلم بیـر کەوتەوە، گۆتمە هـاوڕێی سـەر هەورێ، بەڵام بە هـۆی تێکەڵبوونی بە بەهەشت، وا تێبگەم تێمنەگەیشت:

ئەو خەڵـکە لێـرە هەڵبگـری و لە بێکۆدیـان هەڵیـانڕێژی، هەینـێ قەنـدیل دەبێـتە بەهەشـتێ، دنیـای ئۆلـدار و گـاور و خوانەناسان ڕووی تێدەکەن.

## بنپێی دایکی گورجستان

لە دەریاچەی بەهەشت، نەرم نەرم هاتینە خواری، جێی دەریـــاچە زۆر بڵنـــدە، لە تبلـــیس بڵنـــدترە، گەڕایـــنەوە، گەیشتینەوە جەرگەی شـار کە ناوێکی وەک شـاردینی هەیە، ئەو شـاردینە، ئاگـات لە خـۆت نەبـێ دینـت دەکـات، جـاری لێیگەڕێ، دوایی چەند گرتەیەکی نیشان دەدەمەوە.

نیکۆ دەیویست شتێک بڵێ، چاو و برۆ و پەنجەکانی بە کار دەهێنا، هەرچی شێوەی ئاماژە هەبوو بەگەڕی خست نە من، نە هاوڕێی سـەر هەورێ تێینەگەیشـتین، هێندە نەبێ کە پرسی ئێوە ئینگلیزی دەزانن؟

هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

ئا، شتێکی لێ دەزانم.

نیکۆ بە ئاماژە گوتی:

باشە ڕاوەستن.

نیکۆ مۆبایلەکەی دەرهێنـا، تەلەفـۆنی کـرد، دایە دەسـت هاوڕێی سـەر هەورێ، گوێم لێیە بە ئینگلیـزی قسـان دەکـات، پێشـتر نەمـدەزانی ئەو ئینگلیـزییە دەزانـێ، تەواوێـک قسـەی کرد، بە منی گوت:

ئەوە کوڕەکەی نیکۆیە، ئینگلیزییەک قسە دەکات سەد خۆزگەم بە هیی خۆم، تێگەیشتین نیکۆ دەڵێ:

مـن دەڕۆم، دوای سـەعاتێک دێـمەوە، ئەگەر برسـیتانە، نانی خۆتان بخۆن، ئەگەر حەز دەکەن بە تەلەفریک سەرێک لە دایک بدەن.

تەلەفریـک نـزیکە، دایکـیش لەسـەر چیـایەک ڕاوەسـتاوە بەسـەر شـارەوەیە، دایـک بەژن زراڤـێکە، بەژنـی وام لە خەونـیش نەدیتـووە، خەریـکە سـەری لە هەور دەسـوێ، لەو ساتە پەڵەهەورێکی ڕەشتارە سێبەری لە دایک کردووە.

سـوار بووین، هەڵگەڕاین، هەر دیتت دەستمان گەیشتە هەور، بـایەک لە کێـوی قـافەوە هەڵـی کـرد و هەورەکەی ڕامـاڵی، دەنـا بـێ سـێودوو، پرچمـان تێکەڵـی پرچـی هەور دەبوو.

لە ئاسـمانەوە تبلـیس چ تبلیسـێکە! بە هەر لایەکـدا دەڕوانی تەلاری پڕ لە نەخش و جوانکاری، بە هەر لایەکدا دەڕوانی کڵێسـەی پڕ لە دیرۆک و یادگاری، بە هەر لایەکدا دەڕوانی ڕووبار و پردی پڕ لە جووڵە و وردەکاری، بە هەر لایەدا دەڕوانی کەسکایی و بۆ گەورە و زارۆیـان جێی گەمە و یاری، بە هەر لایەکدا دەڕوانـی ئەسـپ و سـوار و شـیر و تیر، گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

تبلیس لە چ شتێک لە هەولێر دەچێ؟

گوتی:

لە مزگەفت و کڵێسە نەبێ!

وایە، ئەرێ ئەو هەمـوو کڵێسـەیە چیـیە لە تبلـیس؟ خـۆ نـاوی شـاری کڵێسـە لەجێیە، بە قسـەی دادوەری بەرێ بێ، ئەگەر پیـاوە شـیر بە دەسـتەکە نەبـا، ژمـارەی کڵێسـە زۆر

لەوە پتر دەبوو کە ئێستا هەیە، لە نێوان دوو کڵێسە سێیەم دەبـــوو، دادوەری بەرێ کە دواتـــر ناســـیمان و بـــووە چاوساغمان، لەبارەی کڵێسەوە چیرۆکێکی گێڕایەوە:

لەو ڕۆژەوەی ئایینی عیسایی لە ڕێی یاوەرێکی عیساوە پێی نایە خاکی گورجستانەوە، لە بەدبەختیی دەریای ڕەش و کێوی قافدا وەستایەکی تەلارسازی لە پێش هەموان باوەڕی هێنا و بووە عیسایی، هەر لە حەفتەی یەکەم لە نزیـــک تبلـــیس یەکەم خشـــتی یەکەم کڵێســـەی دانـــا، ئەو وەستایە، هەر دەتگوت فریشتە یارمەتیی دەدەن و خشتی بۆ دەخەنە ســـەر خشـــت، لە مـــاوەی هەفـتەیەک کڵێســـە تەواو دەبوو، هەفتانە کڵێسەک قیت دەبووەوە، گورجستان بن کڵێسە کەوت، پیاوێکی تبلیسی، هەستی بە مەترسیی کڵێسە کرد، هەستی کرد وا بڕوات بستە زەوییەک بۆ ماڵ و مەیخانە نامێنێتەوە، هەواڵی بۆ وەستا نارد:

واز بێنێ، خشت نەخاتە سەر خشتەوە، هەرچی عیسایی دنیا هەیە لە کڵێسەکانی گورجستان جێیان دەبێتەوە.

وەستا گوێی نەدایێ، گوتبووی:

بەو ئیبلیسە بڵێن خۆ لە کاری خودایی هەڵنەقورتێنێ.

پیاوی شیر بە دەست خوێن بەرچاوی دەگرێت، یەکپێ دێت، دەبینێ وەستا وا بەردی بناغەی کڵێسەیەک دادەنێ، شیری هەڵکێشا، لە مەچەکەوە هەردوو دەستی وەستای پەڕاند و پێی گوت:

بە من دەڵێی ئیبلیس! پیاوی پیس، ها ئەو دوو خشتەیش بخە سەر خشتەکانت.

تەلەفریک بردینی، لە بن پێی دایک داینایین، دەبێ تەواوێک لێی دوور بکەوینەوە ئینجا دەست و شانەکانی

دەبینین، دایکە گورجی دەستی ڕاستی شیرە، شیرێک لە شاخی هەڵکێشی، دەکشێتەوە، بیوەشێنێ کەرتکی دەکات، دەستی چەپی بادی، بادییەکی لە ناو لەپی ڕاگرتووە، بڵندە نەمدیت تا بزانم پڕ لە ئاوی تەزییە، یان شیری شیرتێن.

لەو ساتە دادە ڕابی تەلەفۆنی کرد:

کەکێ کەریم، برا هنگ ل کودەرێن؟

گوتم:

لە بنپێی دایکی گورجستان دانیشتووین، بەڵام دەترسم دەستی ڕاستی بەرز بکاتەوە.

گوتی:

مەترسە، بۆ ئێوە دەستی چەپی دێنێتە خوارێ...

پێشتر پلکە گووگڵ و دادە ڕابییش باسی هەردوو دەستی دایکی گورجسانیان بۆم کردبوو، دەمزانی ئەگەر کەسێک بە نیازی خراپەکاری، بە نیازی داگیرکاری پێی خستبێتە ئاقاری گورجستانەوە، دایک شیری هەڵکێشاوە، کەسێکیش بە نیازی دۆستایەتی، بۆ مێوانداری سەری بە گورجستاندا کردبێ، دایک بە جامە ئاوێکی بەفراوی کە لە چیاکانی قاف پڕی کردووە، پێشوازیی دەکات.

ئێمە کە لە بنپێیەکانی دایک دانیشتبووین، لایەکی تبلیس لە بنپێمان بوو، ئاخر بنپێی دایک بڵندە، وەک ئەوەی لە ئاسمان دانیشتبی وایە، لە مێوانداریی دایک تێر نەدەبووین، نەیدەهێشت بە جێی بێڵین، زۆری ڕاگرتین، کاتێ هاتینەوە سەر زەوی و نیکۆمان دیتەوە، لە بڕۆی دیارە تووڕەیە، دەزانی چەندمان پێ چوو! هێشتا نانیشمان نەخواردبوو! تێگەیشت، ئێمە لە دەرەوەی کات و کاتژمێر دەسووڕێینەوە.

چـــارەگێکم لەگەڵ خـــۆم بـــردەوە مێوانخـــانە، لە نـــاو گەرماوێ لە ماوەی نیو سەعاتێ هەڵمچۆڕاند؛ خواردنەوە لە ناو گەرماو وەک ئەوەیە لە ناو هەور دابنیشی.

## نێوان مەمکۆڵان، شووشەی شەرابی

ئێوارەیە، لە پێش بازەیلەتا چاوەڕێی ئیدۆ دەکەین، بەڵام نیکۆ هات، بە پەنجەکانی چیایەکی لە ئەستێرە نیشان داین، بە ڕێیەکدا ڕۆیشتین، هێندە کڵێسەمان نەهاتە سەر ڕێ، کەم نیشانەی خاچی کێشا، نزیک کەوتینەوە، ئەو چیایە زۆر بڵند دیارە، لە تەوقی سەری تاوەرێکی بە ئەستێرە نەخشێنراو بە ئاسماندا چووە، هەڵگەڕاین، لە دڵی خۆم گوتم ڕەنگە سەر ئەو چیا لوولەییە، گۆڕاییەکی وای نەبێ، هەر جێی چەند مێزێکی لێ ببێتەوە، هەڵگەڕێ، هەستم دەکرد بە چیای حەسەن بەگدا هەڵدەگەڕێم، ترومبێل باشی نەدەکێشا، نازانم چەندی برد، سەر کەوتین، نیکۆ قوژبنێکی بۆ ترومبێلەکەی دیتەوە...

سەر چیا چەند پانوپۆڕە، زۆر گەورەتر لە سەری حەسەن بەگ، لە شێوە دەڵێی بەنی هەریرە، هەمووی داروبارە، گوڵوگوڵزارە، لێرە و لەوێ فرۆشگای گچکەی لە تەختەدار، چێشتخانە گەورەکەیش پێناچی خشتێکی تێدا بێت، تاوەرەکە دەڵێی بە ئەستێرە نەخشێنراوە، چووینە سەر مێزێکی داری، من بیرە و هاوڕێی سەر هەورێ و نیکۆ چایان بانگ کرد، کچێک بە لەنجەولار هات و پێکی یەکەمی

بۆم تێکرد، لە سنگیەوە، لە درزی مەمکەکانیەوە، گۆرانییە قەراجییەکەم بیر کەوتەوە، چێژی پترم لەو گۆرانییە وەرگرت:

لە دوورڕا دێ بە ڕابی ڕابی
بەینی مەمکۆڵان شووشەی شەرابی
بە ماچ و دوو ناوت بەد نابی

شووشەی شەراب! ئەرێ نێوان مەمکۆڵانی ئەو کچە بۆچی هێندە لە شووشەی شەراب دەچوو! شەوی ئەو بڵندایییەی تبلیس چ شەوێکە! ئەو هەموو کچە جوانە لە کوێوە هاتوون! هەستم دەکرد کەوتوومەتە ناو مانگ و ئەستێران، دەستلەملانێی ئەستێرانم دیت، لە بن داران، لە پەنایان، لە سێبەران کچ و کوڕ دەستبازییان دەکرد، پاشای کۆنی گورجستانیش ئیرەیی پێیان دەبرد، ئەو جێیە بڵندەی تبلیس کە دەتگوت ئاسمانێکی مانگەشەوییە بە ئاسمانەوە، چ ئاسمانێکی ژوانی و دیدارییە، لێرە دنیا سەرگەرمی دڵدارییە، لە گشت لاوە تریفەی ماچ دێ، پێدەچێ نیکۆیش بە لای خاچدا نەچێ، ئەوەتا بە ئاماژە و چەند وشەیەک کە پێویستی فێری کردم، باسی نرخی کچان دەکات، دەڵێ:

هیی زۆر جوان سەد دۆلاری بدێ لەگەڵت دێ، بیست دۆلارییش هەیە، ئەگەر هەر بۆ دانیشتن بێ، بیرەیەک سەر و زیادە.

بە ئاماژە دەڵێم:
ئەو کچانە لە کوێن؟
بە پێکەنینەوە، تەلەفۆنەکەی دەردێنێ:
بە تەلەفۆنێک...

به تـێکەڵەیەک لە فشـە و ڕاسـتی دەڵـێمە هـاوڕێی سـەر هەوری:

ها چ دەڵێی؟

دوای پێکەنینێکی درێژ دەڵێ:

واز بێنە، با دانیشتنەکەمان تێک نەچێ!

لە مەستبوونێکی ئاسمانی باوەڕم بەو چیرۆکە هێنا کە لەسـەر زەویـی گورجسـتان ڕووی دابـوو، پلـکە گـورجی، ئەویش بیستبووی، وای گێڕایەوە:

کۆن، زۆر کۆن، پاشـای گورجستانێ هێند جوانپەرستە بۆ کچێکی جوان دەچێتە ئاسمانێ، دەستوپێوەندی خۆی خڕ دەکاتەوە، پێیان دەڵێ:

بڕۆن بە دنیادا بگەڕێن، کچە هەرە جوانەکان ببیننەوە، بە هەر نرخێک بێ بۆم بێنن.

دەسـتوپێوەند بە دنیـایێ وەردەبـن، لە هەر شـارەی، لە هەر میللەتێـک کچێکـی جـوان لەگەڵ خۆیـان دێـنن و دەگەڕێنەوە، دەگەنەوە شاری تبلیسی، لەوێ هەواڵی مەرگی پاشا بڵاو دەبێتەوە، دەستوپێوەند نازانن چ لەو هەموو کچە بـکەن، چـۆن بیـانگەڕێننەوە زێـدی خۆیـان! نـاکرێ، لەوێ لە تبلیس بەڕەڵایان دەکەن و پێیان دەڵێن:

تـازە نـاگەنەوە وڵاتـی خۆتـان، بۆخۆتـان لێـرە جێـوڕێ ببینەوە، مێرد بکەن و بحەوێنەوە.

بۆیە ژنانی گورجستان جوانترین ژنی دنیان.

وایە، لە ژنانی گورجستانەوە جوانیی هەمـوو ژنـانی دنیـا دەبینییەوە، من جوانیی پلکە گورجییشم دیتەوە.

## کڵێسه له چۆڵەوانیی دنیا

به ڕێـی گۆریـدا تەواوێـک ڕۆیشـتین، به لای ڕاسـتدا پێچمـان کـردەوه، دنیـا کەسـکاییه، له پردێـک پەڕیینـەوه، ڕووبـارێکی به بنـدا دەڕوات، دەڵێـی ڕاسـتەوخۆ هەر له ئاسـمانەوه و له دڵـۆپه بـارانەوه ڕێچـکەی گرتـووه و بەر زەوی نەکەوتووه، ڕوون ڕوون له قووڵایی بەژن پتر، ورده چەو دەدرەوشـانەوه، نیکـۆ، دیـار بـوو لەبـارەی ڕووبـارەوه قسەی دەکرد. لەولاتر نزیک بووینەوه له ڕووبارەکه، نزیک بووینەوه له پەرییەکانی ناو ئاوێ، ژن مەلەیان دەکرد، نیکۆ هێواشـی کـردەوه، بەڵام نیشـانەی خـاچی نەکێشـا، گـوتمه هاوڕێی سەر هەورێ:

هەر له ڕاسـت کڵێسـه نـا، له ڕاسـت ژنـانیش هێـواش دەکاتەوه.

هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

پیاو هەیه ئەو پەرییانه ببینێ، هێواشی نەکاتەوه!

پێشتر له چیرۆکان بیستبووم، پەری هەیه له ناوی ئاوێ دەژیی و جاروبار خۆ نیشان دەدەن، لەوێ به ڕاستی پەریی ناو ڕووبارم دیت، پەریی ناو چیرۆکان به کراسی سپیی وەک بەفـرەوه له ڕووبـارێ دەهـاتنه دەرێ، بەڵام ئەو

پەرییــانەی لێــرە دەیــابنبینم، ڕووت ڕووت، ســپی ســپی لە کراسی بەفریی سپیتر لە ڕووبارەوە دێن، ڕەنگە بیرە ڕۆڵی هەبووبێ لە دیتنی پەرییان.

ڕووبارمـان بە پەرییـانەوە بە جێ هێشـت، گەیشـتینە بـن بەرزاییەک، زۆر لە زوورگەکانی دیـوی ڕۆژهەڵاتـی هەولێر لە وەرزی بەهار دەچوو، لەوێ، لەو چۆڵەوانییە، سێ چوار خـانوو لەســەر جـادە، لە بـن سـێبەری چەنـد درەختێکـی بە ئاسـمـاندا چــوو، شــانیان بە شــانی یەکتــر داوە، یەکیــان فرۆشــگەیە، یەکیــان بە پۆلیســخانە دەچــوو، ئەوی دی لە پەنجەرەکەیڕا دیارە جێی بلیتە، دوو بلیتمـان بڕی، نیکۆ بە ئامـاژە ڕێنمـایی کردین، چۆن چۆنی بڕۆین، ڕۆیشـتین، ڕێ چۆڵە، هاوڕێی سـەر هەورێ گوتی:

توخوا کەس بلیتی چۆڵەوانیی بڕیوە؟

گوتم:

چۆڵەوانی ئاوەدانیی بە دواوەیە.

بەڵام لەبەر پێکەنین وابزانم ئاوەدانییەکەی منی نەبیست، پێدەکەنیی، لەو چۆڵەوانییە، یەک بە دەنگی خـۆی پێدەکەنیی، چەندی دەمگوت:

بە چی پێدەکەنیی؟ چیت بیر کەوتەوە؟

پێکەنـین نەیدەهێشـت وەڵام بـداتەوە، دوای پێکەنینـیش لە بیـری چــووەوە بە چـی پێکەنیـوە، ڕێ بە بـن بـنەداری زۆر گەورە و بەتەمەن درێـژ دەبێـتەوە، سـێبەر دەتـداتە سـێبەر، لێرە و لەوێ لە کەلێنـی لـق و پەلکـانەوە، هەتـاو شـەرمنانە خۆی نیشانت دەدا، ڕۆیشتنێکی باش ڕۆیشتن، لە پێشـمـانەوە چەنـد کەسـێک دەنگیـان دەهـات، ئاورم دایەوە، لە دواوەیـش

چەند کەسێک بە دیار کەوتن، دڵنیا بووینەوە ڕێمان هەڵە نەکردووە.

لەپڕ گۆڕانێکی کتوپڕ هاتە گۆڕێ، ڕێ لە داروبار و کەسکایی و سێبەرەوە گەیشتە عەردێکی ڕووت، لە ناولەپ ڕووتتر، عەردێکی هەتاوی، پێ ناچێ لە تەمەنی سێبەری دیتبێ، عەردێک هەمووی شاخ و بەرد، بۆ تەیەموم لەپە خۆڵێک دەست ناکەوێ، پیاوێکی ڕیشدار و ژنێکی لەچکدار لە تەنیشتمانەوە دەڕۆیشتن، لە سیما و قسەیانڕا بە هیی لای بووخارا دەچوون، ئێستا ڕێ هەورازە، بە چیادا هەڵدەگەڕێین، هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

لێرەیش چیا! ئێ خۆ سەفین هەبوو، بەبێ بلیتیش سەر دەکەوتی.

گوتم:

ڕەنگە ئەو چیایە لە زنجیرەی چیای قاف بێت، با ببیینین، جگە لەوە خەجەپووری و بەرازمان زۆر خواردووە، با هەزمی بکەین.

گوتی:

قاف کالەی ئاسنی دەوێ.

هەستم کرد ئێمە بە هەڵە هاتووین، ئێرە ئەو ئەشکەوتە نییە کە مام گووگڵ بۆی باس کردین و نیشانی داین، نا ئەشکەوتە ئاوییەکە نییە، بەسەر خۆم نەهێنا، هەڵگەڕاین، دەبینم خەڵک دەڵێی مێروولەن ڕێچکەیان بەستووە، ڕێی هەڵگەڕان ڕێ نییە، ڕێچکەیە، ڕێی بزنە، ڕێچکە لە جێ جێ ڕێچکەی تری لێ دەبێتەوە، لە سەرتر تێک دەکەنەوە، ئەو ڕێیە زۆر لە ڕێی پێشانی ئەشکەوتی شانەدەری خۆمان دەچێ، ئەشکەوتێک لێرە، ئەشکەوتێ لەوێ، یەک لە خوارتر،

ئەوی دی لە سەرتر، ڕێک لەو گوندانە دەچوو کە خانووەکانیان بەسەر یەکەوە نین، ئەشکەوتەکان هەموویان لە شێوەی خانوو داتاشرابوون، خانووی دوو چاوەیی، سێ چاوەیی، گەرماویشیان هەبوو، داخۆ هەڵکەندن و داتاشینی هەر یەک لەو ئەشکەوتانە چەند ساڵی ویستبێت، لە بیرم چوو ماڵە ئەشکەوتییە چۆڵەکان بژمێرم، بەڵام زۆر بوون، داخوا لە چ سەردەمێکەوە چۆڵ کراون!

لای سەرێی ماڵەکان، ماڵێکی گەورە، تاقە ماڵە بە ئاوەدانی ماوەتەوە، ئەویش کڵێسەیە، کڵێسەی ئەشکەوتی، لە گورجستان سەرم بە چەند کڵێسەدا کردووە، وەک ئەو کڵێسەم نەدیتووە، ئەگەر ناچار بکرێم لە کڵێسەدا بژیم، لەوەیان سەرپشک بکرێم، بێ سێ و دوو کڵێسە ئەشکەوتییەکە هەڵدەبژێرم، کڵێسە پڕاوپڕە لە ژن و پیاو، لە پشتمەوە گوێم لە ڕستەیەکی پیاوانەی عەرەبی بوو:

خواپەرستی بە تەنیشت مێینەوە هەقە بە دوو قات بۆت بنووسرێ.

ئاوڕم دایەوە، پیاوێک بزەی هاتێ و بە عەرەبی سڵاوی کرد و پرسیی:

تۆیش عەرەبی؟

کاتێ زانیی کوردم و لە هەولێرەوە هاتووم، گوتی:

منیش لە ڕێی فڕۆکەخانەی هەولێرەوە هاتووم، بەغداییم.

هاوڕێی سەر هەورێ تا ئەو کڵێسەیەی نەدی، لە ڕوخسارێرا دیار بوو، ئەو دانە ڕۆژەی تەمەنی بە ئاوێدا ڕۆیشتووە، کڵێسە چاوەیەکی گەورەی هەیە. بن دیوار و بن دیوار بۆن و بەرامەیان داناوە، چاوەی گچکە گچکەی زۆرە، شۆڕ دەبییەوە، وەک بڵێی دوو نهۆمە، هەمووی کون کونە،

بەڵام کونی وا نا لێی بترسێیت و هەناسە سوارت بکات، نا لە کونەکانەوە بۆنی گوڵاو تێکەڵ تیشکی ڕۆژ و تیشکی مۆم و تیشکی نوورە، گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

لە هەندێ مزگەفت بۆنی گۆرییە دێ...

نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، پێکەنیی، زۆر پێکەنیی، گوتی:

ئێ خۆ ئاسانە وا بکەن مزگەفتیش بۆنی گوڵاوی لێ بێ.

گوتم:

هەمیشە بۆنی گۆرییە زاڵە بەسەر گوڵاودا.

بە گوڵاوپژێنی کڵێسە ئەشکەوتییەوە هاتینەوە خوارێ، هاتنەخوارێ لە شاخی پڕ خانووە شاخی و کڵێسە شاخی، جگە لەو ڕێیەی پێیدا سەر کەوتین، بە هۆی نیشانەوە زانیمان ڕێیەکی دی هەیە، ئەو ڕێیە تونێل بوو، تونێلێکی هەڵکۆڵراو لە شاخ، بە پەیژەی شاخی هاتینەوە خوارێ، تاریکە، هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

کێت ویست ماچی بکە و هەڵێ.

گوتم:

تۆ لە قسەی ئازای، بەڵام لە کردەوە هەی لێ هەی لێ...

هاتینەوە سەر ڕێ، هەتاومان بڕی و گەیشتینەوە سێبەر، درەختەکان پیرتر خۆیان نیشان دەدا، ئەوە سەردانە هەڵەیە، هەڵەی زمان بوو، زمانی من یان دادە ڕابی؟! لەوەیان باش گوێم لە گووگڵ ڕانەگرتبوو، دەنا ئەو هەڵەی بەسەردا تێناپەڕێ.

ئەو خانووە ئەشکەوتییانە، ئەو کڵێسە ئەشکەوتییانە، لە بینایی من نەخشیان گرت و تا دەرەنگیش جگە لەوان چیدیم نەدەدیت.

## نیگاری دیرۆک دەگێڕێتەوە

نیکۆ لە ناو ترومبێلەکەی خەوی لێ کەوتبوو، پرخ و هۆڕی بوو، وا دیارە زۆرمان پێ چووە، لێرە وایە، دەچیە هەر کوێ خۆت لە بیر دەکەیت، تێر نابی لە تەماشاکردنێ.

هاتینەوە، گەیشتینەوە ڕووباری پەرییان، ناومان لەو ڕووبارە نا ڕووباری پەرییان، شوفێر پێدەچوو کارێکی گرنگی هەبێ، تیژ دەڕۆی، هەرچەندە تیژییەکەی نەدەگەیشتە ڕادەی سەرپێچیی هاتوچۆ، بەڵام من بە سەرپێچی بۆیم نووسی، بە ئاماژە و چەند وشەیەک پێم گوت:

ئەو خێراییە سەرپێچییە، نەتهێشت لەشولاری پەرییان ببینم.

شوفێر تێنەگەیشت، ئەوەیشم گوت:

ئێمە بە هەڵە هاتینە ئەو ئەشکەفتە، ئەوەی من ویستم ئەو نەبوو.

دەتگوت شتێک لەو قسەیە تێگەیشت، دەستی پێ کرد، بڕێکی تێگەیشتم، ئاوڕم لە هاوڕێی سەر هەورێ دایەوە:

تۆ چی تێناگەی؟

گوتی:

ماندووم، سەرخەوێک دەشکێنم.

گوتم:
زۆر ماندووی؟
گوتی:
پیاو بەسەر سەفینێیش بکەوێ هەر هێندە ماندوو دەبێ.
نیکۆ تەلەفۆن دەکات، دەنگی دادە ڕابیم ناسییەوە، دەنگێکی بێژەرییانەی هەیە، ئا بیرم کەوتەوە، ئەو ژنە لە ڕادیۆ کار دەکات، وابزانم بێژەرە، هێشتا نەمدیتبوو، زانیم لە بەشی کوردیی ڕادیۆی گورجستانە، لە بیرم نییە، بێژەرە یان بەرنامەی هەیە، حەزیشمان دەکرد سەر لە ڕادیۆکە بدەین، وەلێ ڕێک نەکەوت، ئێ، نیکۆ مۆبایلەکەی دا دەستم و گوتی:
بێلا خانم...
دادە ڕابی گوتی:
گەڕانەکەتان چۆن بوو؟
گوتم:
خۆش بوو، بەڵام ئەو ئەشکەفتەی من دەمویست ئەوە نەبوو؟
گوتی:
تۆ لە دووی چ ئەشکەوتێک دەگەڕێی؟
گوتم:
بیستمە ئەشکەوتێک هەیە، دەریاچەی لە ناوە، پلەی گەرمییەکەی چوار وەرزەی ساڵ نەگۆڕە، هاتوچۆ بە بەلەمە.
هاوڕێی سەر هەورێ دیارە بەئاگایە و گوێی لە بەلەمە، گوتی:
ئەوە نییە پێڵاوەکانمان بوونەتە بەلەم...

گۆتمە دادە ڕابی:

مەگەر ئەشکەفتێکی وا بوونی نییە؟ لە نزیک تبلیس نییە؟

دادە ڕابی گوتی:

بـا، لە گورجسـتان هەیە، برایـێ مـن، ئەو شـکەفتەی تـو دبێژی گەلەک دویرە، لە تبلیسەوە ڕۆژەڕێیەک دویرە.

دیـار بـوو لە نێـوان ئـێمە و دادە ڕابـی، لەبـارەی ئەشـکەفتەوە هەڵەتێگەیشـتنێک لە گـۆڕێ بـوو، مـن ڕۆژی پێشـتر کە نـاوی ئەشـکەفتم هێنـا و مەبەسـتم ئەشـکەفتە ئـاوییەکە بـوو، ئەو یەکسـەر بە ئەشـکەفتە وشـکوبرینگەکە تێگەیشـتبوو، هەڵە لە مـن بـوو، لە مـام گـووگڵم نەپرسـیبوو، ئەشکەفتەکە دەکەوێتە جوگرافیای چ شارێکی گورجستانەوە.

گەیشـــتینەوە جەرگەی تبلـــیس، ســـەر ئەو پـــردەی کەوتـووەتە بـن هێڵـی تەلفـریکەوە، بـن ئەو بڵنـداییەی دایـکە میهرەبـان و پـاڵەوانەکەی گورجسـتان بە دەسـتی بـادی و دەسـتی شمشـێرییەوە لەسـەری ڕاوەسـتاوە، لەو دیـوەی پردەکە دابەزیین، بە درەنگەوە نانی نیوەڕۆمان لە لای باجی حەلاو خـوارد، خـواردنی چێشـتخانە گچـکەکەی ئەو بـاجییە لەچکـدارە زۆر خـۆش بـوو، تـورک بـوو، بە هـاوڕێی سـەر هەورێ با، سێ ژەمە نانی دەستی ئەو ژنە بخوات، هـاوڕێی سەر هەورێ زوو ناوی زانی، بەڵام دیار بوو نـاوەکەی بە دڵ نەبـوو، بـۆیە نـاوەکەی گـۆڕی و کـردیە بـاجی حەلاو، چێشتخانەکەی باجی ناندینێکی گچکەیە، بە حاڵ جێی حەفت کەسـی لـێ دەبـووەوە، بە خـۆیەوە پێنج کەس ئیشـیان لێـی دەکرد، لەوەیش خۆشتر، هەر کاتێک بە بەردەم چێشـتخانەدا تێـدەپەڕیی، دەتـدیت هەر شەشـیان دەویـان دەجوولێ و نـان دەخۆن، هاوڕێی سەر هەورێ دەیگوت:

دەڵێی ناندینەکە تایبەت بە خۆیانە.

گوتم:

دەزانن ئێمە غەریبەین، فەرمووومان لێ دەکەن.

دەستاوی باجی حەلاو زۆر خۆش و زۆر هەرزانە، سەد لاریت لە گیرفانی بێ، مانگێک لەوێ نان بخۆ، بایی قاوەیەکی قاوەخانەی کوڕە سوورییاییەکەت پێ دەمێنێ. وێنەیەکمان بە دەستی شاگردە جوانە ڕوو بە پێکەنینەکەی باجی گرت و چووینە قاوەخانەکەی کۆڵانی ماچان، قاوەکەی بەتامە، بەڵام زۆر گرانە، قاوەیەک پارەی سێ چوار بیرەیە، لەوێیش بە دیار قاوەوە، کچێکی ڕەنگ قاوەیی، نەمزانی برسێتی لە چ وڵاتێکەوە گەیاندبوویە ئەوێ، وێنەیەکم گرت.

لەو بازاڕە مۆزەخانەییە، چەند وێنەیەکم گرت و خستمە پاڵ وێنەی ماڵە چۆڵە ئەشکەوتییەکان، خستمە پاڵ وێنەی کڵێسە ئەشکەوتییە گولاوییە ئاوەدانە پڕ لە نەخشونیگارەکە؛ وڵاتی گورجستان وڵاتی نەخشونیگارە، ئەو وڵاتە گوند و شاری، دار و دیواری، ماڵ و کڵێسە و بازاڕی، بەرد و ئەشکەوت و مزگەوت و دیسکۆ و چێشتخانە و مەیخانە و هەمووی، هەر هەمووی نەخشونیگارە. من چێژم لە هەموو ئەو نەخشانە وەردەگرت، نەخشی پشت ئەو ژنە سەماکەرەی بە بیست لاری دەچووە باوەشی پیاوانەوە، نەخشی پشت ئەو پیرێژنەی بە هۆی ڕووخانی سیستەمی سۆسیالیستییەوە لێی قەومابوو، لە بن دیوارێک دەستی پان کردبووەوە، جوان بوون، هەموو ئەو نەخشانە جوان بوون، بە هەموویان نیگارێکن، دیرۆکی جوانیی مرۆڤیان دەگێڕایەوە.

درەنگـانی عەسـر گەڕایـنەوە بازەلیتـا، ئیـدی لەوەودوا چوونەدەرێ و گەڕان لەسەر خۆمانە، بە دادە ڕابیم گوت:

شوفێرێکی کوردمان بۆ پەیدا بکە.

گوتی:

کوردێک هەیە، بەڵام زۆر گرانجانە، دوو قات و سێ قـات داوا دەکات.

گوتمان:

کەواتە ئیدۆمان بۆ بنێرە، زمـانی وی ئاسـانە، ئاماژەکـانی ڕوونن.

## فڕفڕۆکەی دایکی ستالین

ئێوارەیە، ئێوارەی تبلیسی، ئەوەی لە ئێوارانددا پیاسەیەکی نەکردبێ لە دەو ڕووبار و سەر پردی ماسی و بازاڕی مۆزەخانەیی و کۆلانی ماچان و ئەو گەڕەکەی ئەوبەری بازاڕ، کە دەبێت هەزار پێپلکە سەر بکەوی تا دەگەیتە دامەنی، ئەو گەڕەکەی بە دیار ڕووبارەوە لە بەرانبەری دایک، وەک بلێی دەست لە ئەژنۆ دانیشتووە، کەسێک لە ئێوارەی چراخانیی تبلیسی ئەو جێیانەی نەدیتبێ، وێنە و وشە بەلاشە، ناتوانن بە ئێوارەی تبلیسی ئاشنا بکەن، بۆیە چ نالێم، بەلام کاتێ لە دوا پێپلکە ڕووەو ڕووبار، ڕووەو دایکی لە تریفە هەلکشاو ڕاوەستابووم، ئێوارەی تبلیسم وا پێناسە کرد:

کچێکی گورجستانی لە بەر مانگەشەوێکی هاوینی، سنگی تا سەر ناوک کردووەتەوە.

دەلێمە هاوڕێی سەر هەوری:

ئێوارەی تبلیس چەند لە سنگی کراوە دەچێ...

دەلێ:

هات، شیعر هات، ئاگات لێ بێت بەر نەبێتەوە.

به هێنکەهێنێک سەر کەوتین، ئەو پەیژە پێچەڵپێچە تەسکوتریسکە، لە هەندێ جێ ڕک ڕک، لە هەندێ جێ تەواو لار بووەتەوە، هەر دەڵێی پەیژەی ئیبلیسە، پلکە گورجی لە هەقایەتدا باسی ئەو پەیژەیەی بۆم کردووە، بە پەیژەی ئیبلیس ناوی بردووە، دەیگوت:

پەیژەی ئیبلیس بنی لە دەو ڕووبارە، سەری لە ئاسمانە، سەد پێنج و هەزار پێپلکەی هەیە، کاتێ کوڕە هەلاتووەکە ڕێی بەوێ کەوت و پێیدا سەر دەکەوت، لە نیوەی ڕێ تووشی بە تووشی پیرێژنێ بوو، هێواش هێواش پێی هەڵدێنا، پێی سەیر بوو، ئەو پیرێژنە سەد ساڵییە چۆن هێندە پێپلکەی بڕیوە، لە کۆڵی کرد، لەپڕ پیرێژن بە کۆڵیەوە نەما، تومەز ئەوە ئیبلیس بووە خۆی کردووەتە پیرێژن، هەر کەسێک ڕێی بەو پەیژەیە بکەوێت، ئیبلیس بە هەر فێڵێک خۆی دەگەیەنێتە سەر شانی، هەر هیچ نەبێ، خۆی دەکاتە مارمێولۆق و خۆی داوێتە سەر شانی.

من لە سەرکەوتنێ گەیشتمە تەنیشت پیرێژنێ، لەوەوە چیرۆکەکەی پلکە گورجیم بیر کەوتەوە، تەواوێک لێی ورد بوومەوە، گوتم دەبێ ئیبلیس نەبێ! ئەرێ ئەو پیرێژنە چۆن بەو هەموو پێپلکەیەدا هەڵگەڕا!

سەر پەیژەی ئیبلیس ئاوەدانە، دە سەر دەکەون و بیست دێنە خوارێ، لە زۆر جێیش شان لە شان دەخشێ، خۆ ئەگەر هەست ڕاگری و خۆ بگری، دەستلەملانێیش دەبینی، لە هاتنە خوارێ، لە پێچێک کوڕ و کچێک بە شێوەیەک خزابوونە ئامێزی یەکترەوە، بە ئاسمانیش لێک نەدەبوونەوە.

ئێره پردێکه له شێوەی ماسی دروست کراوه، دەچیه ناو زگی، باشه پێستەکەی له شووشه ڕوونتره، له هەردوو لاوه ڕووبار دیاره، ئاسمان دیاره، کەس نییه بێته ناو زگی ماسی، چەند وێنەیەک نەگری، له چرکەیەکدا دەیان وێنه دەگیرێ، ئێمه له هەردوو سەر ڕێمان کەوته ناو زگی ماسی، له چوون له زارییەوه چووینه ژووری و له گەڕانەوه له زاریەوه هاتینه دەرێ.

ئێستا لەسەر پرده کۆنەکەین، پردی کۆن زۆر کۆنه، هیچ دوور نییه ڕۆستاڤیلی لێره، لەو شوێنەی من لێی ڕاوەستاوم، خەیاڵ بردبێتیەوه و خۆی هەڵدابێته ڕووباری کوڕاوه و چەند دێرەشیعرێکی گرتبێتەوه، من ڕۆستاڤیلی دەبینم، لەو پیاوەی ئەو بەرەوه ڕۆستاڤیلی دەبینم، چەند بەو دەچێ، به ڕۆستاڤیلیی نیوه ئەفسانەیی دەچێ.

ئەو ژنه فرفرۆکەفرۆشه! وێنای دەکەم، به کەسێک دەچێ، بۆ بیرم ناکەوێتەوه کێیه؟

له هاوڕێی سەر هەورێم پرسی:

نازانی ئەو ژنه به کێ دەچێ؟

گوتی:

با بچین چایه و قاوەیەک بخۆینەوه، به بیرمان دێتەوه کێیه.

نا، بێ قاوەیش دەیناسمەوه، هەوه، ئەو ژنه پلکه کەتانه، کاترینه، دایکه کلۆڵەکەی ستالین، سوێندتان لەسەرم نییه، ئەوه دایکی ستالینه، من له جێیەک وێنەی دایکی ستالینم دیتووه، کتومت ئەو ژنه فرفرۆکەفرۆشەیه. هات سڵاوی کرد و فرفرۆکەیەکم لێی کڕی، گوتم:

تۆ دایکی ستالین نیی؟

لە زمانم تێگەیشتبا، وەڵامی بەڵێ دەبوو!

گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

ناسیمەوە، دایکی ستالینە.

گوتی:

کێ دەڵێ کچی ستالین نییە!

نا، کچی نەبوو، دایکی بوو، دوایوەی دەستی منداڵە لاسارەکەی گرت و ئاوایی گۆریی جێ هێشت، کێ دەڵێ ڕێی بەسەر ئەو پردەی تبلیس نەکەوتووە، کێ دەڵێ لێرە دەرۆزەیشی نەکردووە!

دەمویست زوو بگەمە کۆڵانی ماچان، بەڵام پێم لە پردی یادەوەری نەدەبووەوە، بۆخۆم ناوم لەو پردەی کە ڕۆستاڤیلی و دایکی ستالین و ستالینی منداڵم لەسەری بینی، نا پردی یادەوەری، لەو سەر پردە زۆر پەیکەرتاش و سترانبێژ و هۆزانڤان و پاشا و وەزیر و گزیرم بینی، بەڵام ناوی کەسیانم بیر نەکەوتەوە.

هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

نەچینە کۆڵانەکە؟

دەڵێم:

دەچین، کەسم نەناسییەوە.

دەڵێ:

کێت نەناسییەوە؟

بە منگەمنگ وەڵامیم دایەوە، تێنەگەیشت.

## کۆڵانی ماچان

ئێـرە کـۆڵانی ماچـانە، کـۆڵانێکی مانگەشــەوییە، گڵـۆپی نـاوی، تـریفەی مـاچ ڕووناکـت دەکـاتەوە، دڵنەوایـی تەمەنـی بەســەرچووت دەداتەوە. مــاچ، یەکەم ژوان و یەکەم ماچـت بیر دەخاتەوە. ئەو کۆڵانە نازانم ناوی چییە، بەڵام هەر دەبێ کـۆڵانی ماچـان بـێ، جـگە لە وشــەی مــاچ ﭺ وشــەیەک لەو تابلۆیەی سەری کۆڵان کە نـازانم چیی لـێ نووسـراوە، جێی نابێتەوە! کۆڵانی ماچان قەیسـەریی هەڵکەوتـووە، بەڵام نە بە چاتی دەچێ، نە چینکۆ، دەڵێی پەڵەهەورەکـانی سـەر تبلیسـە، یـان دەڵێی قژی ژنـانی گورجسـتانە، بـای کێـوی قـاف هەڵـی کـردووە و بە ئاســمانی ئێخســتووە، چەنـدی لە ئاســمانی کۆڵانی ماچـان ورد دەبمەوە، جگە لە هەور و ژن ﭺ نـابینم، هاوڕێی سەر هەوری سەر هەڵدەبڕێ و دەڵێ:

بڕوانە، هەر من و تۆ نێرگەلەمان لە دەست نییە.

لەو قسـەیەوە گومـانم لە پـرچ و هەور پەیـدا کـرد، بەڵام گومان لە دووکەڵ زووتر ڕەوییەوە.

کۆڵانی تەنگەبەری ماچان لە مـن بووەتە قەیسـەری، هەر بێیــنە بــازاڕ دەبێــت ســەری لــێ بــدەین، قاوەخــانەی سوورییەکەیش، بووەتە چایخانەی مام خەلیل، گڕگڕ دێینەوە

لای کـچە ڕەنـگ قـاوەییەکە، جێمـان پتـر مێـزەکەی سـەر دەرگایە، کەمتر ژووریێ، هاوڕێی سەر هەوریێ پیاڵەی چا و من پێکێ بە دەستمەوە، لە کۆلانی ماچان دوای حەفت ساڵ وازهێنـان، گەڕامەوە، پـاکەت و چەرخـم هەڵگـرتەوە، بەڵام مـژی سـووک، وەک ماچەکـان سـووک، لەوێ ئەگەر سەرژمێریی ماچان بکەیت، لە هەر چرکەیێ مـاچێ دەچێتە تۆمارخانەی ماچانەوە، ماچی قووڵم نەدی، باش بوو نەمدی، دەنـا منـیش مـژی قـووڵم لە جغـارە دەدا و بە تەواوی فێـر دەبوومەوە.

مـاچ مـاچ، هەمیشـە مـاچ، لە دوای هەر هەڵـدانێ چەنـد ماچێ، درەنگ زانیم لە کۆلانی ماچان مەزە ماچ و نێرگەلەیە، بەڵام مـن بیـرە بە بیـرە دەخـۆمەوە، بە دیـار مـاچەوە هێنـدە بیرەم بە بیرەوە هەڵدا، تـا گەیشتمە نیوە مەستبوونێ، هەر هەڵمـدەدا، هەسـتم دەکـرد هەنـدێ لەو کەسـانەی دێـن و تێـدەپەڕن دەیانناسـم، ئەرێ لە دنیـایێ چەنـد کەس لە سـیما کتومـت وەک یەکـن؟ دەبـێ زۆر هەبـن، وەخـتە بڵـێم درەختەکان چەند لێکدی نزیکن، مرۆڤەکانیش هێندە شـێوەی یەک دەدەن، لەوێ عەبدلڕەزاق بەدرخانم دیت، لەگەڵ ژنێکـی لە تەمەنـی خـۆی شـتێ گچکەتـر، هـاتن و لە مێـزەکەی تەنیشـتمان دانیشـتن، گـوێم هەڵخسـت، بە زمانێـک قسـەیان دەکرد، لە ڕووسی دەچوو، ئاوڕم دایەوە لەسـەر ئەوە بـوو، بە کـوردی بەخێرهـاتنی بـکەم و وێنەیەکـی لەگەڵ بگـرم، هـاتەوە بیـرم کـوڕە خـۆ عەبـدلڕەزاق بەدرخـان ئەوڕۆیە مردووە! سەد ساڵ نابێ؟! من شـەوێک لە وێنە نـا، لە خەون دیتبووم، لە تەنیشت سمکۆی شکاک دانیشـتبوو، شـتی فێر دەکرد، باشە ئەو پیاوە زیندووە بۆ هێندە لەو پیاوە مـردووە

دەچی، تۆبڵێی کەسێکی نزیکی نەبێ! یان من بۆچی ئەو پیاوە هاتە خەیاڵمەوە و لە پیاوێکی کۆڵانی ماچان سیمایم دیتەوە؟

دوور نییە خەیاڵەکە لەوەوە هاتبێ، عەبدلڕەزاق بەدرخان سەدەیەک لەمەوپێش لەپێناوی شتێک بۆ کورد، سەری بە هەموو شوێنێکدا گرت، هاتبووە ئێرەیش، تبلیس، ماوەیەک لێرە لە تبلیس ژیاوە، لەوێ قسەیەکی وام بۆ هات:

بەدرخان، تۆ زۆر گەڕایت، گەیشتیە ئێرەیش تا کەمێک سیاسەت بۆ کورد ببەیتەوە، بەڵام من هاتم تا چەند ڕۆژێ دوور لە سیاسەتی کوردی پشوویەک بدەم.

لە کۆڵانی ماچانەوە من بە بیرەی ڕووسییەوە بە سەدە گەڕامەوە دواوە، گەڕامەوە دیرۆکی گورجستان کە بە تیر و شیری عەرەب و تورک و فارس و ڕووس خوێنی لێ دەچۆڕێ، هەست دەکەم تبلیس ئێستایش لە شەڕە، تۆ بە شاردا بسووڕێوە، بە هەر لایەکدا دەڕوانی، سوارە، تیر و شیرە، ئەسپ هەستاوەتە سەر پاشوو، پەیکەرەکان تەنێ دیرۆکی شەڕ ناخوێننەوە، هەر ئێستا، لەو شەوەدا شەڕیش دەنووسنەوە، تاکە جێیەک شەڕ نەیگرێتەوە، کۆڵانی ماچانە، ئەو هەمووو ماچە، لەخۆڕا نییە، هەڵاتنە لە شەڕ، حەسانەوەیە، لەبیربردنەوەیە.

ئەو شەو لە منەوە دیرۆک دەئاخڤێ، ئەوەتا کڵاوڕەشەکان دێن، شیر هەڵدەکێشن لە کێوی قاف و برینی قووڵ دەکەوێتە سینەی گورجستانێ، هەر ئەو کڵاوڕەشانە کێو و کێو دەڕۆن لە سندووسی بن سابڵاخێ هەڵدەدەن و تیر داوێژنە قەندیل و خوێن دەچۆڕێ لە شانی کوردستانێ، گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

دەزانی کوردستان و گورجستان زۆر بە یەک دەچن؟

پێکەنیی:

ستان، ستان، ستان.

ئاگــام لـــێ بـــڕا، ئەو بە چ بزانێـــت مـــن ڕۆ چـــوومەتە دیـرۆکەوە، ئـاخر کـۆلانی ماچـان کەی جێـی شــەڕ و تیـر و شیرە، ئەو شەوەی کۆلانی ماچان بۆ من دیرۆکی بوو!

## ستالین، منداڵی بن درەخت

ئەورۆ نیازمان ماڵی ستالینە، پێش ئەوەی بگەمە ئاسمانی گورجستان، لە خەیاڵم حەفت جێ لە پێشەوەی جێیان بوون کە پێویستە بیانبینم: تبلیس، بن پێی دایک، کۆنترین کڵێسە، ئەشکەوتی ئاوی، دەریای ڕەش، ماڵی ستالین، سەمای دۆلفین، ئەورۆ نۆرەی ماڵی ستالینە ئەگەر لە ماڵ بێ.

لە دادە ڕابیم پرسی:

لە ماڵە؟

گوتی:

بەڵێ، ئەورۆ پشوو نییە.

ئەوەیشی گوت:

من لەو بن پاڵە تا ئێستا ماڵیانم نەدیتووە، خەمی لێ دەخۆم.

گوتم:

دێ پێکڤە بچین.

نەهات، ئیدۆی لەگەڵ ناردین. هاوڕێی سەر هەورێ پرسیی:

- ماڵی ستالین لە کوێیە؟

- لە گۆڕییە.

گۆری چییە؟ پێدەچێ لە سەردەمی پلکە تێکاترینا، ئەو پلکەی لەسەر پردەکە فرفرۆکەی دەفرۆشت، گوند بووبێت، بەڵام هەوکە گۆیە شارە، کەوتووەتە کوێ؟ تەواوێک لە تبلیس دوورە.

لە دەرەوەی تبلیس لە پێش فرۆشگەیەک شوفێر ڕای گرت، گوتی:

ئەگەر شتێکتان دەوێ بیکڕن.

من یەک وشەی ئەرمەنی و گورجیی نازانم، بەڵام لە زمانی ئیدۆ تێدەگەم، ئەویش لە من تێدەگات. ئێ، من چوار پێنج بیرەم هێنا، هێشتا پێی لێ نەنابوو، سەری بیرەم هەڵپچڕی، لە هیکرا ئیدۆ پڕی دا بیرەکەی دەستم، بە زمانی خۆی هاواری کرد، نەیخۆیتەوە!

باشە بۆ نەیخۆمەوە؟ تۆبڵێی لە ڕێوبان قەدەغە بێ! یان هەست دەکات، ژەهر، شتێکی تێدا بێت! من دەڵێم:

دەیخۆمەوە، بۆ نەیخۆمەوە؟!

ئەو دەڵێ:

مەیخۆوە، چونکێ...

لەوەی دوای چونکێ تێناگەم، سەیرە لەوە تێک ناگەین، بیرەکانی لێ وەرگرتم و دەیویست بەسەر فرۆشگەکەیدا بداتەوە، هاوڕێی سەر هەورێ کە بیبسیی بە دەستەوە بوو، بە ئاماژە گوتمە ئیدۆ:

ئەدی ئەوە نابەیتەوە؟

بە ئاماژە گوتی:

نا ئەوە ئاساییە، حەرام نییە.

ئیدۆ وشەی "حەرام"ی خۆمانی بە کار هێنا، سەیرە، ئەو وشەی لە کوێ هێنا، لەگەڵ ئەو وشەیە، بیرەکانی هێنایە

نزیک دەموچاوم، بە ئاماژە بەسەر لێویەوە کرد و بە لادا هات و خۆی سەرخۆش کرد، هاوڕێی سەر هەورێ پێکەنیی و گوتی:

تێگەیشتی مەبەستی چییە؟

گوتم:

ئای لەو...

ئیدۆی مەسیحی وا تێگەیشتبوو منی موسڵمان بە هەڵە بیرەم هەڵگرتووە، وام زانیوە بیبسییە، یان خاوەن فرۆشگە بە ئەنقەست بیرەی بە بیبسی بە من فرۆشتووە، دەیویست لەسەر ئەو کارە بچێت سیاسەتی بکات، لە ڕێ گوتمە شوفێر:

بیرەیێ بخۆوە.

دیار بوو زۆر حەزی لێ بوو، بەڵام ئەگەر بیشمرێ فرێکی لێ نادات، یاسای هاتوچۆ پێشێل ناکات، لە هاژۆتنیش خێرایی دیاریکراوی نەبەزاند...

لە ڕێی گۆری، لە ئاوەدانییەکانی دەو ڕێ، ماندوویەتیی گورجستان ڕوونتر دەردەکەوێ، وڵاتێکە بە ناو شەڕی گەورە گەورەدا هاتووە و بێرە گەیشتووە، خشت نیئە، درەخت نییە برینی پێوە نەبێ، گورجستان کەسکاییە سروشتییەکەی، وێرانییەکەی داپۆشیوە، پێوەی دیار نییە، وڵاتێکی هەمیشە بەهاری نەبا، برینەکانی هەموو دەکەوتنە گۆڕێ، وڵاتێکە هەست دەکەم لە ناوەوە خوێنی لێوە دەچۆڕێ.

ڕێی گۆری هەر ئەو ڕێیەیە کە کۆنترین کڵێسە لە دەستی لای منەوە دیارە، شوفێر سەر نەوی دەکات و بە پەنجە نیشانم دەدات و منیش هەر بە دەست و پەنجە دەڵێم:

سەرم لێی داوە.

پێش ئەوەی بگەینە گۆری، هەر بە دەستی من ماڵە ئەشکەوتییەکان لە بڵندابیەوە دەرکەوتن، شوفێر هەندێ قسەی لەبارەیانەوە کرد، کەمی تێگەیشتم، لە چاوی منەوە ئەشکەوت لە گۆرییەوە هێندە دوور نییە، دووریش نییە سەردەمانێک باپیرە و داپیرە گەورەی ستالین لەوێ ژیابن، ڕەنگە ستالین خۆیشی لە ترسی هێرشی ڕووس یان تورکان چەند شەو و ڕۆژێک لەوێ خۆی حەشار دابێ.

لە دووڕیانێ، شوفێر دەستی لای خۆی گرت، گەیشتینە ئاقاری گۆری، کەوتینە ناو درەختان، درەختی بڵند، زۆر بڵند، سەریان لە پەڵەهەورەکان دەسوو، درەختی زۆر ئەستوور، چوار زەلام باوەشیان پێدا بکەن، سەری پەنجەیان ناگاتەوە یەک، درەختەکان زۆر بەتەمەن دیارن، ساواکەیان لەو ژنە بەتەمەنترە کە لەسەر پردە کۆنەکەی تبلیس فرفرۆکەی دەفرۆشت، شوفێر دەڵێ:

گەیشتین، ئێرە گۆرییە.

دوو سێ منداڵ گەمە دەکەن، بە دەوری درەختێکدا دەسووڕێنەوە، منداڵێکیان بە درەختەکەدا هەڵدەگەڕێ، زۆر لەو وێنە منداڵییەی ستالین دەچێ کە زۆر جار مام گووگڵ نیشانی داوم، گوتم:

ئەها، ئەوە ستالین نییە؟

شوفێر لە پێکەنیندا لەسەر پشت کەوت.

هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

ستالین لە ناو ئەو درەختە جوانانەوە هاتووە؟

ویستم بڵێم:

بەرازیش لە ناو درەختی جوانەوە دێ.

ئیستۆپێکی توند لە بیری بردمەوە، شتێک هاتە پێش ترومبێل، نەمزانی چ بوو، لە چاوی منەوە زۆر لە بەراز دەچوو.

##ماڵی ستالین

ئێره ناو گۆرییه، خانووەکان له ناو دارودرەخت بزرن، له کەلێنی قەدی درەختانەوە کۆسپی سەر دەرگا دەردەکەون، له کەلێنی لقی درەختەوە، پەنجەره به نازەوە له ڕووت دەکرێنەوە، دوای چەند پێچی گەیشتینه جادەیەکی پان، پێچمان کردەوە، دەرگایەکی گەوره به ڕێزەوە مێوانداریی کردین، دابەزیم، له حەوشەیەکی گەوره کەوتمه بەر سێبەری ستالین، یەکەم جارمه ئەو پیاوه بەشانوشەوکەته له نزیکەوە ببینم، دەڵێی درەختی گۆرییه ڕاوەستاوه، پیاوێکه پیاو شەرمی لێ دەکات، بۆ چەند چرکەیێ گەڕامەوە حەفتاکانی سەدەی بیست و چوومەوە ماڵی پیاوه کۆمۆنیستەکەی کۆڵانمان، وێنەیەکی گەورەی له سەرەوەی تەلەڤزیۆنەکەیان هەڵواسیبوو، هەبوو دەیپرسی:

ئەو پیاوه سمێڵ بابڕه کێیه؟

مام کۆمۆنیست دەیگوت:

ئەوه ستالینه، شێری خوا نا، هیی مرۆڤایەتی.

وەک دەڵێن هەموو گورجستان بگەڕێی، بۆ یادگارییش وێنەیەکی ئاسەواری کۆمەنیستی و سۆڤیەتی نابینییەوە، کەچی ستالین، ئەو پیاوەی ڕژێمێکی پێ دەناسرێتەوە،

ئەوەتا لێرەیە، کەمێک ماندوو دیارە، بزەی سمێڵی دێتێ، دەڵێی هەر ئێستا لە شەڕی جیهانی گەڕاوەتەوە و پشتی هیتلەری لە عەرد داوە.

بە بەر سێبەری ستالیندا چووینە ژوورێ، لەسەر دەرگا ژنێک وێنام کرد، بەڵام نەمناسییەوە، دواتر بیرم کەوتەوە زۆر لە ژنی دووەمی ستالین دەچوو، بە ڕوویەکی خۆشەوە بلیتی داینێ و بە پەرۆشەوە ڕێی سەرکەوتنی نیشان داین، دیوەخانە، لەسەر پەیژە ستالینێکی گچکە دانیشتبوو، لە سەرتر ستالینێکی دی، لە سووڕانەوەی سەرێ دیسان ستالین، ستالین لە هەموو پەیکەرەکانی نیگاکانی هێند تیژن، لە تەماشاکردن ناچاری چاو بتروکێنی.

ئێستا بە ناو ماڵە تازەکەی ستالیندا دەسووڕێینەوە، ماڵی تازە گەورەیە، بە هەر دیوارێک، بە هەر لایەکدا دەڕوانی ستالین دیارە، لە هەر جێیەک شتێک، پاشماوەیەکی ستالین دانراوە، ژنێک لەبارەی مۆزەخانە یان ماڵی تازەی ستالینەوە بە ئینگلیزی قسە دەکات.

ئەوە کتێبەکانی، من پێشتر لە هەندێکیان، هەندێکم خوێندووەتەوە، لەبارەی زمانەوەیە، لەبارەی لینینەوە، لەبارە دیالەکتیکی نازانم چییەوە، ئەوە دەستنووسەکانی، ئەوە پێنووسەکەی، داخوا واژۆی مەرگی چەند کەسی پێ کردووە! ڕەنگە هەر بەو پێنووسەی واژۆی پەرتەوازەکردنی کوردی کردبێت، دوور نییە عەرەبی شەمۆیش بە هۆی ئەو پێنووسەوە هەڵدرابێتە سیبریاوە! لە هۆدەیەکی دی پۆتین و کڵاو و ساقۆ درێژەکەی وەک خۆی بە نرتونوێیی ماونەتەوە، کە پێشتر لە وێنەی جووڵاو و وەستاو دیتوومن، ئەوە تەلەفۆنەکەی، داخوا لێیەوە چەند ڕستەی

هەڕەشەئامێزی بۆ یار و نەیار ناردووە، ئەوەیش پایەکەی، ورد لێی ورد بیەوە، تەنکە دووکەڵێکی پێوەیە، تەپڵەی جگەرە، ئەوە شەترەنجەکەی، لە دیدی منەوە لە باری کش لینینە...

لە ماڵە تازەکەی ستالین هاتینە دەرێ، شەمەندەفەرێک لە بن دیواری حەوشە ڕاوەستاوە، ژنێکی گۆری، لە سیمایدا پێدەچوو لە بنەماڵەی ستالین بێ، بە ئینگلیزی هاتە قسە، من هێندەی تێگەیشتم:

ئەو وارگۆنە ستالین لە ناوی دانیشتووە، هەر بەوە چووەتە کۆنگرەی نازانم چی و کوێ.

چووینە ناوی، وەک خۆی پارێزراو بوو، خۆش بوو، هاوڕێی سەر هەورێ ناو شەمەندەفەری زۆر پێ خۆش بوو، گوتی:

حەز ناکەم دابەزم.

گوتم:

دانابەزین، گەشتێک لەگەڵ ستالین دەکەین.

گوتی:

ئەگەر ئەو ژنە جوانە دانەبەزێ، تا بنی دنیا لەگەڵی دەڕۆین.

ئەو چوو وێنە لەگەڵ ژنەکە بگرێت، منیش بە دیار وێنەیەکی ستالینەوە کە بەسەر کورسییەکەوە بوو، چوومە خەیاڵەوە، شەمەندەفەر ڕۆیی، لەگەڵ ستالین گەشتێکی چەند خولەکیمان بە شەمەندەفەر کرد، هەر بەو شەمەندەفەرە چووینە ماڵە کۆنەکەی ستالین.

ماڵی کۆنی ستالین هەر دوو سێ دارتێل لە ماڵە تازەکەی دوورە، خانوویەکی گچکە هەر جێی خۆیان دەبێتەوە،

میوانیان هەبێ دەبێ لە دەرەوە دانیشن، کۆنە، زۆر کۆن، لە دایکی ستالین بەتەمەنترە، لە پەنجەرە گچکەکەوە دایکی و باوکی دەبینم، بابی ستالین تووڕە دیارە، ڕەنگە لەو تووڕەبوونەوە بڕیاری هەڵاتنی دابێت، دوای ئەوەی تێروپڕ لە ژن و منداڵەکانی دەدات، ڕۆیشتووە و ماڵ و منداڵی بەسەر ژنە قوڕبەسەرەکەی بە جێ شتووە.

لە هاتنەدەرێ، لە بن دیواری ماڵی ستالین کوڕ و کچێک چووبوونە باوەشی یەکترەوە، گۆتم:

دڵداری بە بەرچاوی ستالینەوە.

هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

با ستالین لێیانەوە فێر بێت.

ماڵاواییم لە ستالینی بە پێوە وەستاو کرد، دیتم ئیدۆ لە ساتی خۆبەستن چاوێکی لە ستالین بڕی، بە دەستەکانی جووڵەیەکی کرد، دەتگوت نیشانەی خاچ دەکێشێ، تێنەگەیشتم ستایشی کرد یان نەفرەتی بۆی نارد.

## مزگەفتی تەبایی

سوورڕێکمان بە ناو گۆڕیی ستالین لێ دا، لە چاوی ئەو دوو ئەویندارەی لە بن دیواری ماڵی ستالین ئەوینداریيان دەکرد، بیرەی گورجستانیم هەڵدا، شوفێریش خستیە سەر گۆرانیی ئەرمەنی، ئاوازەکان زۆر نزیک بوون لەو ئاوازە کوردییانەی کاتی خۆی لە ڕادیۆی یەریڤان دەمبیستن، من بە زمان پرسیم:

کوردین، یان ئەرمەنی؟

ئیدۆی ئەرمەنی تێگەیشت، بەڵام نەیتوانی بە زمان تێمبگەیەنێت، بۆیە بە پەنجەکانی وای وەڵام دایەوە:

ئاوازی کوردی و ئەرمەنی لێکدی نزیکن.

هاتین هاتین، لە بن تبلیس چێشتخانەیەک هەیە، بارێک هەیە، دەڵێی چەند کەپرێکە بەسەر لقەکانی درەختێکی زۆر بڵندەوە نا، بەڵام پانوپۆڕی پڕەوە، مرۆڤەکان لەسەر ئەو کەپرە کەسکانەوە پتر لە باڵندە دەچن، لەوێ لە کەلێنی پەلکانەوە، باڵندەی زۆر ناسک و جوانم دیت، کەوێک لە بەرانبەرم هەڵنیشتبوو، هێندەی شەراب هەڵدا، دەندووکی شەرابی هەڵگەڕا، گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

ئای بۆ پێکێ لەو شەرابە!

ڕسته شەرابییەکەی منی نەبیست، ڕەنگە خەیاڵی چووبێته لای شەرابێکی دی.

هاتین هاتین، گەیشتینەوە سەر پردی کۆن، چاوم لە دایکی ستالین گێڕا، نەمدیتەوە، شوفێر سەد لاریی وەرگرت و ڕۆیی، چووینەوە کۆلانی ماچان، بە دیار ماچی گورجستانییەوە، قاوەیەکی عەرەبیم خواردەوە.

گەشتیار بە دانیشتن کاتی وێرانە، تبلیس هەڵگەڕان و داگەڕانە، گەڕان زوو هێزت لێ دەبڕێ، بەڵام ئێمە تا پێمان لە دوومان بێ، دەگەڕێین، نیازمە سەرێ لە تاقە مزگەفتەکەی تبلیس بدەم، کەوتووەتە بڵندایییەک لەسەر ماندووبوون زەحمەتە بیگەینێ، قسەی من نییە، ئۆباڵ بە ملی مام گووگڵ، دەڵێ:

شیعە و سوننە خودایان یەکە، پێغەمبەریان یەکە، ماڵیان یەکە، بەڵام مزگەفتیان نا، لە هیچ مزگەفتێکی دنیایێ شیعە و سوننەیەک نابینی بە تەنیشت یەکەوە ڕاوەستن و بۆ خوای خۆیان نوێژ دابەستن، مزگەفتەکەی تبلیس تاکە مزگەفتە، شیعە و سوننە لە خۆی کۆ بکاتەوە و ناکۆکیی نێوانیان لە بیر بباتەوە. ویستم بچمە ناو مزگەفتە نەوازەکەی تبلیسەوە، بیستم:

تەنها ڕۆژی هەینی ئاوەدانە.

ئەوەیشم بیست لە ڕۆژی هەینی دوو وتار هەیە، وتارێ لە زاری مەلای سوننی، وتارێ لە زاری مەلای شیعە.

بە دەوری مزگەفتدا سووڕامەوە، لەسەر هەندێ لە خشتەکانی، نازانم، نە چاوم ڕەشکەوپێشکەی کرد، نە جێدەستی عوسمانلیم دیتەوە، مزگەفتی تبلیس لە تاقانەیی لە

یەکەم مزگەفتی موسڵمانان دەچێ کە لە یەسریب بەردی بناغەی دانرا.

گۆتم:

وابزانم تەبایی شیعە و سوننە لێرە، لە بێمزگفتییەوەیە، وا نییە؟

هەیهوو، بۆ کێ قسە دەکەم، خۆ من کەسم بە تەنیشتەوە نییە، هاوڕێی سەر هەورێ وا لەگەڵ کچە دەرۆزەکەرێ قسە دەکات، کچێک وێنەی زۆر کەمە، هەر دەڵێی مانگی ناو تەمە، دیتم بە بەرچاوی شەقامەوە ماچێکی کچی ناو تەمی کرد، گوتم:

سەرەتایەکی باشە، ماچ لە دەرۆزەکەرەوە دەست پێ بکات، ڕەنگە بە کچی سەرۆک کۆتایی بێ!

وابزانم وەها مەستی ماچەکە بووبوو، گوێی لەو قسەیەیشم نەبوو، دەنا شتێکی هەر دەگوت، گوتم:

ماڵی موسڵمانان داخراوە، با سەرێک لە ماڵی جووەکان بدەین؟

گوتی:

حەز دەکەی سەر لە ماڵی شەیتانیش دەدەین.

گوتم:

با منیش ماچی دەرۆزەکەرێ بکەم، ئەوجا دەچینە ماڵی شەیتان.

هەیهوو، نەیبیست، خۆ لە تەنیشتم نەماوە، گەیشتە خوارێ، چما پیاو بە ماچێ وا باڵ دەگرێ!

چووینە خوارێ و سەر کەوتینەوە، ئێستا لەسەر دەرگای ماڵی جووەکەین، ماڵێکی کۆنە، پیرێ لێمان نزیک کەوتەوە، دەستی بە ڕیشی خەنەییدا هێنا و قسەیەکی کرد،

من به بەخێرهاتن تێگەیشتم، ئەو پیاوە زۆر لە حەزرەتی مووسا دەچوو، مووسای ناو خەون، دەبێت بڵێم، من خەونم بە مووساوە دیتووە، زۆر لەو پیاوە دەچوو کە لە پێش ماڵی مووسا دیتم.

لە ماڵی مووساوە چووینە ماڵی عیسا، لەوێیش دوو سێ پیاوم دیت، زۆر لە عیسا دەچوون، عیسای ناو ئەو وێنەیەی بە هەموو دنیادا بڵاو بووەتەوە، تەلەفۆنم بۆ دادە ڕابی کرد:

لێرە ماڵی محەمەد و مووسا و عیسام دیتەوە.

نازانم لە قسەکەم باش تێگەیشت یان نا، گوتی:

بە دوای ماڵی کێدا دەگەڕێی؟

گوتم:

ماڵی زەردەشت، ماڵی بووزا، ماڵی...

گوتی:

ماڵی کەسیان لەوێ نییە.

گوتم:

ئێزدییەکانی ئێرە ماڵێک، کەپرێکیان نییە؟

هێڵ پچڕا، کاتێ هاتەوە سەر هێڵ، گەیشتبووینەوە مێوانخانە.

## حەسرەت بۆ شەمەندەفەر

زوو لە خەو هەستام، تبلیسم لە دەمی کازیوەدا دی، تبلیسی کازیوەیی لە چی دەچێ، ژنە گورجستانییەکەم نەدیتبا، تبلیس جگە لە خۆی شێوەی چ شتێکی نەدەدا، سپێدەیەک لە پەنجەرەوە چاوم کەوتە سەر ژنێ، لە جێگاکەی هاتە دەرێ، دەستی چەپی بە سنگیەوە گرت، بە دەستی ڕاست پرچی هەڵدایەوە، ئەو ژنە کازیوەییە هەر دەڵێی تبلیسی ناو کازیوەیە.

لە چاوەڕوانیی پڕبوونی پاس لە گەراج ڕاوەستاوین، ئیدۆ گوتی:

نەفەر و بیست لاری پتری نەدەنێ.

هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

بە بیست لاری

دەچین بۆ یاری

لەوێ ئەو لاری و یارییە قسەی سەر زاری بوو، هەر گوێی لە وشەی لاری با، بە یارییەوە دەیگوتەوە، گوتم:

بەڵام ئەو جارە یارییەکە لە ناو دەریایە، دەوێری؟

گوتی:

لاری لاری

لە ناو ئاگریش هەر یاری
ویستم بڵێم:
بە ڕاستی بوێریت.

دەستی قۆڵمی ڕاکێشا، ئاوڕم دایەوە، پیرێژنێکی کەڵەگەتی ڕەقوتەق، دەڵێی تازە لە ناو گۆڕ هاتووەتەوە، ڕوخساری دەتگوت پەلکە تەماتەی بەر هەتاوە، پەنجەکانی دەتگوت چیلکەن، بنێشتی دەفرۆشت، بە تەنیشتیەوە، پیرێژنێکی کورتەبالای قەڵەو، زۆر قەڵەو، ئەویش ڕەنگی مردووی گرتبوو، بەڵام وەک بڵێی لە گۆڕ جێی نەبووبێتەوە، بۆیە بە ناچاری لەسەر زەوی بسوورێتەوە، ئەوەیان خەجەپووری دەفرۆشی، لەولاتر پیرەمێردێ ماندوو دیارە، چەند جێیێ لە ڕوخساری برینداره، دوور نییە برینەکانی جێی نووکە شیر بن، دەڵێی هەر ئێستا لە شەڕی تورکان گەڕاوەتەوە، ئەو پیاوە جگەرەفرۆشە.

کچێک دەڵێی دوێنێشەو مانگ لە کاتی هەڵهاتنی بۆ کارێک بە تریفەدا ناردوویەتیە سەر زەوی و لە کاتی ئاوابووندا لە بیری چووە هەڵیکێشێتەوە، ئەو کچە تریفەییە، ئەو کچەی لە جوانیی کەموێنەیە، شەقشەقە و گوڵفرۆشە، منداڵێک منداڵیی خۆمی بیر هێنامەوە، شتێ دەفرۆشێ لە شێوەی کرێمستییە، بەڵام کرێمستی نییە.

گەراج و دەوروبەری گەراج، پڕە لە خەڵکی جلکشڕ، لەم لاپەڕگەیەی شار دەڵێی گرانی و قاتوقڕییە، لە نزیک ئاودەستخانەکە کە گوناهە تبلیس ئاودەستاخەی وا لە خۆی جێ بکاتەوە، بە دەنگێک هەر خۆم نا، دەبێت کەسێکی دییش گوێی لێ بووبێت، گوتم:

تـــــۆبڵێی ئەو هەژاریـــــیە لـــــێکەوتەوەی ڕژێـــــمە سۆســـیالیزمییەکەی لینـــین و ســـتالین بـــێ - بە ئاگـــا لە جیـــاوازیی نێـــوان ئەو دوو پیـــاوە - یـــان پەیـــدابوونی گورباچۆف و ئاکامی نەمانی ڕژێمەکە!

پیاوێ بە چاوێکەوە تەماشای کردم و دەستی بە قسان کـــرد، مـــن هەر لە ناوەکـــان تێگەیشـــتم: لینـــین، ســـتالین، گورباچۆف. ئەو پیاوە گورجستانییە، پیلی گرتم و دەیویست ئەگەر بە لێدانیش بێت، هەر دەبێت لە قسەکانی تێبگەم، تـا تێینەگانـــدم وازی لـــێم نەهێنـــا، تێگەیشـــتم، کـــاتێ نـــاوی گوربـاچۆفی دەهێنا، بە جووڵەی لێو و پەنجە، نەفرەتـی بۆ دەنارد، تێیگەیاندم کە ئەو هەژارییەی ڕووی لەوان کردووە، بە هۆی گورباچۆڤەوە بووە، ناوی لینین و ستالینی بە باشـە دەهێنـا، بە ئامـاژەی پەنجە لە باشـەیان تێگەیشتم، ئـاخر بە زمـانی ئامـاژە چ وشـەیەک هێندەی وشـەی "باشـە" ئاسـان نییە، لە وشەی بەڵێ و نەخێر ئاسانترە.

ئەو پیـــاوە دژەگوربـــاچۆڤییە، پیلمـــی ڕاکێشـــا، بـــردمیە ئەوسەری گەراجەکە و سـەر ئەو قەراغەی بەسـەر کەندێکی گەورەی درێژدا دەڕوانێ، بە پەنجەکانی گوتی:

ببینە، ئەوانە دەبینی؟

چ ببینم، دنیایێ شـەمەندەفەری لەکارکەوتوو، ئەوە چییە، بە هەر لایەکدا دەڕوانـی تـا چـاو بـڕ دەکـات شـەمەندەفەر، پیاوەکە حەسرەتی بۆ شەمەندەفری سەردەمی سۆسیالیزمی هەڵدەکێشا؟ یان بۆ شەمەندەفەری تەمەن؟ بۆ هەردووکیان؟ چـاوی چەپـی پڕ فرمێسـک بـوو، چـاوی ڕاسـتیم نەدیتەوە، دەیویست تێمبگەیێ بۆچی شەمەندەفەری نیشانم داوە، دیتم

پاسەکەمان جوولا، مالاوییم لە پیاوی دیار شەمەندەفەر کرد و گوتم:

حەیف، قسەمان تەواو نەکرد.

وابزانم تێگەیشت، بە ئاماژەی دەستەکانی گوتی:

چی بکەین! ئەوهایە...

لە لای پەنجەرە دانیشتم، کورسییەکان گچکەن، جێی پێ زۆر تەسکە، منیش پێم نەخەمە سەر پێ ناتوانم، خەمم هاتێ، ئەو ڕێیە دوورە بەو دۆخە نابڕێ.

گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

تا دەگەینێ، نەمرم باشە.

سەری کەمێک خوار کردەوە وگوتی:

پیاو لە گورجستان نامرێ.

ئەوە چییە! لە کورسیی پێشم شۆخێ دانیشتبوو، دەتگوت تبلیسە و تازە ڕۆژی لێ هەلاتووە.

گوتم:

ڕێ چەند دووردرێژ بێ، خۆشە.

گوتی:

بە مەرجێ ئەو زوو دانەبەزێ.

خودایە، خودای گەشت و گەڕان! تا سەر دەریا ئەو شۆخە بهێلەوە، ئەگەر نیازی دابەزینیشی هەیە، لە بیری ببەوە، کەس بە تەماشا نەبووەتە پاشا، بەلام من دەبمێ، دەچمە سەر تەخت و سەرتریش دادەنیشم.

## دار و دار تا دەریا

بە نێوانی ماڵە ئەشکەفتییەکان و گۆڕیی ستالیندا ڕەت بووین، من لە پەنجەرەی ڕیزی شوفێرەوە دانیشتووم، لە کەلێنی دارانەوە چەند وێنەیەکی دوور بە دووری ئەو دارستانەم گرت کە گۆڕیی لە دنیا شاردووەتەوە، هەر گۆری نا، بە هەر دۆڵێکدا دەڕوانی، بە هەر چیایەکدا دەڕوانی، هەموو دارستان و لێڕەوارە، دەشتودەر کەسکە، هەمیشە بەهارە، جێی ڕەشماڵی نابینییەوە، بێ درەخت، بێ کەسکایی، دەبێت لە کەلێنی درەختە سەر لە هەورەکان، بۆ خانوو، بۆ مەڕوماڵات، بۆ مرۆڤ بگەڕێیت.

دەو ڕووبار و دەو ڕووبار، لە پردەوە بۆ پرد، بنار و بنار، پێچ لە پێچت دەکاتەوە، دۆڵ و دۆڵ و چیا لە چیا دەتگرێتەوە، هەموانیش لە ناو دارستانی چڕ، ئێمە بە کۆڵانی تەنگەبەری درەختدا دەڕۆین، دارستانی چڕ، هێند چڕ، تۆبلێی پڵنگ بتوانێ ڕاوی تێدا بکات!

لە جامەوە دەبینم، درەختی زۆر بەتەمەن دەبینم، هیی سەردەمی منداڵیی ستالین دەبینم، باشە گورجستان حەفتا ساڵێک نەبێ، هەموو تەمەنی لە شەڕدا بەسەر بردووە،

چۆنە هەر بە دارستانی ماوەتەوە، تۆبڵێی ئاگری شەڕ هەر مرۆڤی سووتاندبێ، لە درەخت خۆی لا دابێ!

گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

هەست بە هەناسەتەنگی دەکەم.

گوتی:

هیی دارستانە، تەماشای دەرێ مەکە.

گوتم:

قسەی تۆیە، بای ژۆرێ بۆ هەناسە چێترە!

چاوم خستەوە سەر شۆخی ناو ترومبێل، با گەمەی بە پرچی دەکرد، هەناسەم تێکەڵی ئەو شنەیە کرد کە لە پرچی پەخشانیەوە دەهات، سوێندتان لەسەرم نییە، هەناسەتەنگیم نەما، پێدەچێ پاسنشینان هەموو گورجستانی بن، لە ڕێیێ لە ئاواییەکان، ناوە ناوە یەک دوانێ دادەبەزن، دوو سێ کەس سوار دەبن، پاس دەمێ پڕ ژنە و پیاو کەم، دەمێ پێچەوانە دەبێتەوە، هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

خودایە، گوند گوند ژمارەی ژن زیاد بکەیت.

دەڵێم:

بەس ئەوەی پێشمان دانەبەزێ.

دەڵێ:

پێناچێ دابەزێ، نابینی جلکی مەلەوانیی لە بەرە!

دەڵێم:

تا کەنار لەگەڵمانە؟

دەڵێ:

لە ناو دەریا بیبینەوە.

لە بڵندایی دۆڵێ، پشوومان دا، تا گەیشتینێ، وەک بڵێی بە ئاسماندا هەڵگەڕابین، کەچی دوو چیای دارستانی

بەسەرمانەوەیە، وەک بڵێی ئێمە کەوتبینە قووڵایی زەوییەوە، دوو چیای هەزار بە هەزار، هەر کتومت چیای قافەکەی ناو هەقایەتانە، چێشتخانەیەکی ساکار لە شێوەی ساکاریی خەڵکەکەی ڕای گرتین، خواردنێکی لە خۆی ساکارتری داینێ، چ هەوایەکی هەیە ئەو شوێنە، بە هاوڕێی سەر هەورێم گوت:

پیاو لە سەرەمەرگ بێ، بگاتە ئێرە، سێ ساڵ تەمەنی درێژ دەبێتەوە

گوتی:

ڕەنگە هەر نەمرێ.

چ هەوایەکی گورجستانی هەیە ئێرە، پاسێکی گەورە وەستا، هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

گورجستان بووە عەرەبستان.

دابەزین، گەڕەکێک عەرەب دابەزین، یەکیان ڕووی لە من کرد، بە عەرەبی:

چۆنی، عەرەبی کوێی؟

بە کوردی گوتم:

بە عەرەب دەچم، بەڵام عەرەب نیم.

بە کوردی گوتی:

ببوورە، وام زانی عەرەبی.

ئەو کوڕە کوردی خانەقین بوو، بەگەڵ کاروانی عارەبان کەوتبوو، قسە قسە، خزمی لەیلا قاسم دەرچوو، لە دەریاوە دەگەڕانەوە.

بڕۆ، کێو و کێو، تۆ بڵێی قاف و قاف بڕۆ، لەبەر درەختیش چ جێ دیار نییە، زۆر ڕۆیشتین، دەڵێی گەیشتینە دەشتایی، ئا ئێرە دەشتاییە، لەپڕ، زۆر لەپڕ، ترومبێل

گەیشتە ئاپۆرەی ترومبێلان، باشە بۆ، نە شارە نە هیچ، تۆبڵێی ڕووداوێکی ترسناک ڕووی دابێت، لە جامەوە سەر دەردێنم چ دیار نییە، دیار بوو سەرنشینان دەیانزانی مەسەلە چییە، هەر ئێمەی بەستەزمانی زماننەزان تێنەگەیشتین.

تەواوێک ڕاوەستاین، لە کەلێنی دارانەوە شەمەندەفەرم دیت، تیژ، لە با تیژتر تێدەپەڕی، شەمەندەفەر منی گەڕاندەوە منداڵی، کە لە نزیک یاریگای هەولێرێ چاوەڕێی شەمەندەفەرمان دەکرد و بە نیازی بوونە دە، پێنج فلسیمان دەخستە سەر هێڵەکە و دوور دەکەوتینەوە.

گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

تۆیش پێنج فلسیت دەخستە بن تایەی شەمەندەفەرەوە؟

پێکەنیی، زۆر پێکەنیی، پێدەچوو گوێی لە پرسیارەکەی من نەبووبێ و بەو پیاوە پێبکەنێ کە لە بن دارەکان ماچی بۆ پەلکی داران دەهاویشت، دووریش نییە ئەوی نەدیتبێ و بە قسەکەی من پێکەنیبێ، دەمویست لێی بپرسم:

ئەرێ بە کامیان پێدەکەنی؟

پرچی کچەکە لە بیری بردمەوە، دەزانی چۆنی هەڵدایەوە و تاڵە درێژەکانی بە ڕووم کەوتن و زوو گەڕانەوە، دەنا دەمگرتن و بە ئاسانی نەمدەدانەوە.

لە منیش چاوم سەرنشینان کرد و سەرو ماچمان بۆ شێتەی ماچهاوێژ هاویشت، ئەو دینەی ماچی دەستخستە ناو لەپی و گاڤێ بە هەڵگرتە هەڵی دەدان، گاڤێ لە شێوەی هەڵفڕینی پەڕەسێلکە، داروباری، مرۆڤ و باڵداری، ڕێوبانی بە ماچ نەخشان، هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

چەند جوانە، مرۆ دین بێت و بە ماچ بگرێ.

دینه جوانەکەمان لە ناو ماچەکانی خۆی بە جێ هێشت و ڕۆیشتین.

بـڕۆ دەشـت و دەشـت، بە کـۆلانی درەختانـدا بـڕۆ، لە جێیەکی کەمێک بڵندایی، هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

ببینە، دەریا ببینە!

ڕوانیمە دوور، گوتم:

ئەوە دەریایە؟

گوتی:

ئەدی خۆ بیابانیش نییە!

گوتم:

دەڵێی لچکێکی ئاسمانە و بەر بووەتەوە سەر زەوی.

گوتی:

بینووسەوە، شیعر هات.

## ڕەشی پێش زەردەپەڕ

لەولاوە لچکێکی دەریام دیت، ئێستا لەسەر بڵندایيەکین بەسەر دەریاوە، دادە ڕابی لە تەلەفۆنەوە:

- چ بوو، نەگەیشتنە باتوومی؟
- وا خەریکە دەگەین.
- زۆرتان پێ چوو.
- وایە، شەش سەعاتە بەڕێوەین.
- تەلەفۆنی خۆ بدە شوفێر.

دامێ و لێم وەرگرتەوە، ژنە کوردە گورجستانییەکە گوتی:

لەو جێیەی دادەبەزن، ئەو چاوەڕوانتانە.

باسی ئەوی بۆ کردبووین کوردە، لە سەردەمی سۆڤیەت دادوەر بووە، هەر بۆیە ناوم نا دادوەری بەرێ، ئێستا بە ترومبێلەکەیەوە چاوساغیی ئەو کوردانە دەکات کە بۆ گەشت دێنە باتوومی، دێنە سەر دەریای ڕەش. لە نزیک کەنار ڕاوەستاین، گوێم لێیە لە دەردوە دەنگێک بە کوردی دەڵێ:

کەرەم کێیە؟ کەرەم.

ناوی خۆم ناسییەوە، من لە گورجستان لە زاری ئیدۆ و نیکـــۆ و دادوەری بەرێ بووبـــوومە کەڕەم، ئـــێ، دادوەری بەرێ، چ دادوەری بەرێ، هەر بەژن و بـــاڵایە، دەموچـــاوی نابینی، هەر چوار پێنج پارچەی کوردستان بگەڕێ، کوردی وا درێژ نابینییەوە.

ترومبێلێکی بڵندی جوانی هەبوو، ئەو جۆرە ترومبێلانەم زۆر کەم لە تبلیســێ دیتبـوو، ســوار بـووین، هـاوڕێی ســەر هەورێ گوتی:

تکایە، بەرەو دەریا باژۆ.

دادوەری بەرێ زوو دەرکەوت پیاوێکی گاڵتەچییە، گوتی:

پەلە مەکە، با میوانخانەت نیشان دەم، ئەوجا برۆ ناو ژن و دەریا و هەر مەگەڕێوە.

پەلەی کـرد، دەیویســـت خـۆ هەڵـداتە خـوارێ، لە نـاو ترومبێلەوە باوەشی بۆ دەریا کردەوە، میوانخانە خانوویەکی ســێ چـوار ژووریـیە، نـاوی ڤێـرۆنەیە، چـووینە چـاوەیەکی گچکە، گۆتمە دادوەری بەرێ:

بزانە هێڵی ئەنتەرنێت لێرە هەیە؟

گوتی:

برا، ئەنتەرنێت چ تشتە؟

دەبـوو ئەنتەرنێـتم هەبـێ، چـونکێ جاروبـار حەزم بە دیداری گووگڵ دەکرد.

حەزی دەریـــا مانـــدوویەتیی نـــاو ترومبێلـــی لە بیـــر بـــردینەوە، پشـــوومان نەدا، دەریـــا لە ڤێـــرۆنەوە نـــزیکە، عەســـرانێکی درەنـــگە، لە دوورەوە باوەشـــمان بـــۆ دەریـــا کـردەوە، کەنـار سەرانســـەر بە پڕی، لەشـولاری ڕووتە، تـا گەیشـتینە ئـاو، چەنـد جـار ڕێمـان گـۆڕی، جێ نییە پێـی لـێ

دانێی، من زوو خۆم ڕووت کردەوە، یەکەم جارمە پێ دەخەمە ناو دەریاوە، سارد نییە، یەکەم جارمە تامی دەریا بکەم، خوێواوکە، دەڵێی بیابانێک حوشتر بە بارە خوێوە کەوتوونەتە ناویەوە، یەکەم جارمە لە دەریا مەلە بکەم، بایی هێندە نازانم خۆم بە دەریادا بدەم، بەڵام خۆم پێدا دا، بە ئاماژە بە ژنێکی ناو دەریام کە لە ڕێی هەڵەوە دەستم بەر شانی کەوت، گوت:

من مەلە باش نازانم، ئاگات لێم بێت.

بزەیەکی هاتێ، مەگەر پەریی ناو دەریا بزەی وا شیرینی بێتێ، تێگەیشتم کە دەڵێ:

نا، نەکەی، من هەقم بە سەرتەوە نییە.

چی بکەم، نەیگرت، دەنا لەسەر دەستی ئەو پەرییە ئاوییە دوور نەبوو ببمە باشترین مەلەوانی دەریای ڕەش!

بە هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێم:

وەرە ناو دەریا، ئەدی لە دوورەوە باوەشت بۆی نەکردبووەوە؟

دەڵێ:

جیاوازیی نییە، هەست دەکەم لە ناو دەریا دەگەڕێم.

دەڵێم:

سەر کەنار و دەریا دوو شتن، تا پێ نەخەیتە ناویەوە، نازانی چ چێژێکی هەیە.

دەڵێ:

هەر کەسەو بە جۆرێک چێژ وەردەگرێت.

هێی دەریا!

بەقەد عەرد و عاسمان، ناوی تۆم بیستبوو، بەڵام لە لێواری خەونێکیش لە نزیکەوە نەمدیتبووی، تۆ تەنها لە ناو

کتێبـان، لە ڕووی شاشـان هەبـووی! لە منـداڵییەوە نیـازی سەردانی تۆ لە سەری دابووم، چەند درەنگ کەوت.

هەوکە لەو تەمەنە، تەمەنـــی نیـــو ســـەدەیی، لەو دەمەوئێوارە دەریاییە، دەریای ڕەش، وا بە دیار شەپۆلی پڕ شـڵپوهۆڕەوەم و لە ڕێـی پەڵەهەورێ کە دەڵێـی تیلمـێکە، لە دەریـا و بـا هەڵیـداوەتە ئەو ئاسـمانە، لە ڕێـی ئەو تـیلمەی دەریـــاوە گەیشـــتمەوە کـــانییە ڕوونەکەی بەر تـــریفەی مانگەشـەوی نـاو خەیـاڵ، نـاو شـیعر، دوای چەنـد تـاوێ، لە خەیـاڵ و کـانی دابـڕام و هـاتمەوە و خـۆم هەڵـدایەوە نـاو دەریـا، شـــەپۆلێ هەڵــی دامەوە کەنــار، دوو ســێ بیــرەی جــۆرجیم هەڵـــدا و لە دڵەوە و لە بەر خـــۆمەوە کـــانییە ڕوونەکەم گوتەوە:

کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو
لە بنیا بلەرزێ، مرواریی زیخ و چەو
جوانترە لە لای من لە دەریای بێسنوور
شەپۆل...

دەڵێی چـی! دەریـا چەنـد جوان بـوو، بەڵام لە چـاوی مـن جوانیی کانیی نەدا.

پەڵەهەورەکـان تـا دێ لێکدی نزیـک دەبنەوە، پەڵەهەوری ڕەش ڕەش، دەریا ڕەشتر دادەگەڕێ، هەر دەبێ ناوەکەی لە ڕەنگەکەیەوە هـاتبێ، نەک لە شـوێنەکەیەوە، ئەوەی دەڵـێ بە باشـوور گـوتراوە دەریـای سـوور و بە بـاکووریش دەریـای ڕەش.

ڕۆژ لە سـەر ئـاوابوونە، یەکەم جـارمە ببینم ڕۆژ نـوقمی دەریا بێ، لە دەریا ئـاوا بێ، زەردەپەڕ جوانییەکی نـاوازەی بەخشییە دەریا و ئاسمان، لەو ئاوابوونە، نـازانم، نە ئاسـمان

بە هەورەوە دابەزیی، نە دەریا بە هەوردا هەڵکشا، هەوری سەر دەریا لە هیی سەر چیا نەویترە، لەو ئێوارەیە تێکەڵبوونی لە بینایم گیرایەوە، نەمدیتبوو، لە هیچ تابلۆیێ نەمدیتبوو.

ئەو دوو سێ شەوەی لەوێ بووم، هیچ زەردەپەڕێکم لە دەست خۆم نەدا، دەبێت بڵێم زەردەپەڕی سەر دەریا تا دڵ حەز بکات و جوانە، بەڵام لای من ناگاتە زەردەپەڕی بەهارییانەی دەم کەلی شاخان.

## سەمای دۆلفین

شەو درەنگ، زۆر درەنگ گەڕاینەوە ڤیرۆنە، هاوڕێی سەر هەوریێ دەڵێ:

ئێمە دەبوو یەکسەر بێینە ئێرە، ئەو چەند ڕۆژەمان لە تبلیس بەفیڕۆ دا.

گوتم:

ئەو جوانییەی لە تبلیس هەبوو، لێرە نییە.

گوتی:

دەریا، دەریا، هەر دەریا.

گوتم:

تۆ پێت نەخستە دەریاوە، چ دەریا دەریاتە!

گوتی:

هەر دەریا.

ماندووم، هێند ماندوو دەڵێی لە کێوی قافەوە هاتووم، لە ماندوویەتیدا خەوم لێ ناکەوێت، لە بەرانبەر ڤیرۆنە فرۆشگەیەکی گچکە هەیە هەر هێندەی نانەدێنەکەی پلکە گورجی دەبێ، پیرێژنێکی بەسەرەوەیە کەمێک لە پلکە گورجی دەچێ، ڕێ نییە بچیە ژووری و دەست لەسەر شت دانێی و بە خۆت هەڵگری، دەبێت ناو بڵێیت و بۆت دێنێ، وشە ڕووسییەکە بەکەڵکم هات:

لۆدی، لۆدی.

لــۆدیی هێنــا، چ لــۆدی، یەک جەرە دەبــوو، دەبەیەکــی گەورەی نازانم چەند لیتری، چارەگێک شیری شێریشم هێنا، ئەو ژنە وای زانی من ڕووسی دەزانم، دەستی بە قسە کرد، منـیش هەر ســەرم بە "بەڵــێ" بــۆی دەلەقانــد، ئەو شــەوە وێنەیەکم بە دیـار دەریـای ڕەش بـۆ ژنەکەم نـارد، لە بنـی نووسیبووم:

هێنـد لە نـاو دەریـا دەمێنمەوە، تـا وشـکانیی تەمەنێک لە لەشم دەتوێنمەوە.

نووسیبووی:

بە مەستی دەریات لێ نەبێتە مەلەوانگەکەیماڵی خۆمان، خۆت لێ بدەیت و نەتبینمەوە!

بۆیم نووسییەوە:

نا، ئیزرائیل لە مەستیدا گیان لە کەس وەرناگرێتەوە!

بەڵام خەوەنووتکە ئەو ڕستەیەی نەنـاردبوو، ئەو شـەوە خەونم بە دەریا و دۆلفینەوە دیت.

دادوەری بەرێ دێ، بەرلەوەی بچیــنە دیــار ســەمای دۆلفین، چووینە کافتریایەکی گەورە، گوتی:

ئێرە جێی پیاوی گەورەیە، هەر بەرپرسێک بێتە باتوومی، سەر لێرە دەدات و قاوەیەک دەخواتەوە.

هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

دیارە ئێمەیشت خستە ڕیزی پیاوی گەورەوە!

گوتی:

ئێوە لای من زۆر گەورەن.

گوتم:

نا، کاکە، ئێمە گەورە نیین، بەرکمان بایی سێ چوار جێی ئەوها ناکات.

من تا ئەو ساتە دۆلفینم تەنها لە تەلەڤیزیۆنەوە دیتبوو، هەوکە لە هۆڵێکی زۆر گەورە، بە دیار گۆمێکی شانۆییانەی درێژووکانیی گەورەوە دانیشتووین و چاوەڕوانی هاتنی دۆلفینین.

بەر لە هاتنی دۆلفینەکان، با قسە لەگەڵ دادوەری بەرێ بکەین، دەڵێ:

ئێستا ماچ و ڕامووسانی دۆلفین دەبینن.

گوتم:

خۆ شتی گەورە ناکەن.

گوتی:

نا هێندە بێشەرم نین.

هاوڕێی سەر هەورێ:

سووکە ماچ، یان ماچی قووڵ؟

دادوەری بەرێ:

مرۆڤ دەبێ لە دۆلفینەوە فێرە سەما و دڵداری بێ.

دەرکەوتن، دوو کوڕ و دوو کچی دۆلفینی و هەشت نۆ دە دۆلفینی کوڕ و کچی گەیشتن، چ سەمایەک دەکەن لە ناو ئاوێ، هەڵدەستنە سەر کلک! دەڵێی مایینی سەماکەر سەمای پێ کردوون و ڕای هێناون، چەند بە ناز دەچنە ئامێزی یەکترەوە، ناسک ماچی یەکتر دەکەن و ماچ هەڵدەدەن، دەڵێی دەستەخوشکی کچە عاشقەکانی گورجستانن...

بەر لە دوماهی، هەر دۆلفینێ چووە باوەشی کوڕێکەوە، چووە باوەشی کچێکەوە، چەند جوانە ڕامووسانی مرۆڤ و دۆلفین، لە ماچ تێکەڵ دەبن، ناناسرێنەوە، کیهە کچە، کیهە دۆلفین! کیهە کوڕە، کیهە دۆلفین! سەمای دۆلفین و کچ و کوڕەکان مەستیان کردم، مەستبوونێ ئەگەر وردە

ماسییەکان نەبان، هەر لە مەستی دەمامەوە، ئەو هەموو وردە ماسییەیان کردە کوێ!

لە هاتنەدەرێ، دادوەری بەرێ گوتی:

بە دڵت بوو؟

گوتم:

زۆر، بەڵام...

گوتی:

بەڵامی چی؟

گوتم:

ماسی، ماسی...

هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

دەریایەک ماسییان قووت دا.

گوتم:

دۆلفین بۆ هەر ماچێ، هەر جووڵەیێ، چنگە وردەماسییەکی وەردەگرت.

هاوڕێی سەر هەورێ گوتی:

با سبەینێیش بێینەوە، من لە سەمای دۆلفین تێر نابم.

گوتم:

ئەگەر واز لە ماسی بێنن، دێمەوە، دەنا...

گوتی:

تۆ ماسی ناخۆیت؟!

لەوێوە بۆ سەر دەریای ڕەش، بۆ ناو لەشولاری سۆر و سپی، بۆ ڕووتبوونەوە لە پۆشاک و وشکانی، بۆ توانەوە لە ئاو و خۆدانە دەست شەپۆل، شەپۆلی لە ئەسپی سەرشێتی دەریا سەرشێتتر.

## سەمای ئاو

بیستبووم لە باتوومی، باتوومیی کەنار دەریای ڕەش، شۆخە کراس هەمیشە تەڕەکەی گورجستان، جێیەک هەیە بۆ سەمای ئاو، سەمایەک نە باران سەمای وای کردووە، نە مایین، نە ژن، نە زۆربا، نە هیچ ئاوێک، سەمایەکە تایبەت بە ئاوی ئەوێ، سەمای ئاوی دیار دەریای ڕەش، درەنگانی شەو دەست پێ دەکات.

با بچینە سەمای ئاوێ، نەرم نەرم ئەو شەقامە دەبڕین کە لە تەک دەریا بە ئاڕاستەی تورکیا درێژ دەبێتەوە، گڵۆپەکانی ئەو شەقامە لە گڵۆپی چ شەقام و جێیەک ناچن، سەد سوێند دەخۆی کەرتە ئەستێرەن بە دارتێلەوە، شەوێکی ئەستێرەییە و نمە بارانیشی لەگەڵە، دنیا ڕژاوەتە شەقام، هەموو بە ئاڕاستەی ئەو جێیەی کە ئاو مرۆڤ فێرە سەما دەکات، ئا، گوێم لە کوڕێکە، بە "لۆ"یەک زانیم هەولێرییە، بە برادەرەکەی دەڵێ:

نەتدیتییە، ببینە ئەوجا دەزانی ئاو مرۆڤ فێری سەمای ئاوی دەکات.

ماندووم، لە دەریاوە هاتووم، ئەو ئێوارەیە دەریا زۆر ماندووی کردووم، هێند لە ناوی مامەوە چی نەمابوو بنووم،

شەپۆل هێندەی هەڵدام و لە بەردی خشاندم، هێندەی بە ناو بەردا ڕەتاندم، لەشم شین و مۆر بووەتەوە، دەزووریێتەوە، بە دیار سەمای ئاوەوە دانیشتووم، حەز دەکەم بچمە دەستی ئاوەوە و پێچی سەما بکەم، لێ توانای هەستانەوەم نییە، بۆیە دەبمە وێنەگر و لە سووچێکەوە وێنەی سەما دەگرم.

مۆسیقایەک نەرم نەرم دەڵێی لە پرووشە بارانی پاییزییەوە هەڵی کردووە و دەستی شەوبای گرتووە، ئاو ناسک ناسک سەمای ئاوی دەکات، سەمایەک هەر لە ئاو دەوەشێتەوە، هەر ئاو دەزانێ چۆن لەگەڵ بای ئاوازەکە بیهێنێتەوە، ئاو و ئاواز بە شێوەیەک ئاوێزانی یەکترن، مەگەر ئەویندااران بتوانن لاسایی بکەنەوە. هاوڕێی سەر هەوری دەڵێ:

به دیار سەماوە خەوت لێ نەکەوێ.

دەڵێم:

نا، وا وێنەی دەگرم.

دەڵێ:

کوا کامێراکەت؟

دەڵێم:

چاو، چاو، کامێرای ناوێ.

دەڵێ:

وا بکە بن ئەو دارێهێ دەربچێ.

ئۆی! من تا ئێستا چاوم بە بڵندایی ئاوەوەیە، ئاو بە سەماوە، بە ڕەنگی جودا جوداوە، دوو سێ دارتێل پتر دەچێتە ئاسمان و دێتەوە، تازە چاوم کەوتە سەر زەوی، چ دەبینم، زەوی یەک پارچە کچ و کوڕە، کچ و کوڕی

نیوەڕووت، درەنگ نیگام کەوتە بن درەختەکە، درەختێکی کەمێک دوور لە درەختان، درەختێکی باریکەلە لە چاوی من شێوەی ماینێک دەدا کە بە شێوەیەک هەستاوەتە سەر پاشوو، لەوەیە پشتەوشکێن ببێتەوە، خۆی تاقانە نیشان دەدا، لە بن درەختی تاقانە، ژنێک تەنیا، سەما دەکات، باشە بۆ تەنیایە؟ پرسیم:

تۆبڵێی لە پیاو بێزار بووبێت؟

وەڵام نەبوو، منیش تەنیا مابوومەوە، جێی خۆم گۆڕی، چوومە سەر بەردێک کە دەتگوت بەرخە لە ناو فریز ڕاوەستاوە، لەوێ درەخت و ژنەکە نزیکتر و جوانتر و ڕووناکتر دەرکەوتن، هاتە سەرم، لێی بپرسم:

ئەرێ سەما بە تەنێ خۆشە؟

لەو ساتە گەنجێ، پێنەدەچوو گورجستانی بێ، لێی نزیک کەوتەوە، قسەیەکی کرد، بەڵام ژنە پێدەچوو دابڕابێ لە دنیایێ، نە ئاوڕی لێ دایەوە، نە گوێی دایێ، بەردەوام بوو لە سەمایێ، باش بوو پتر نەچوومە پێشێ و هەر لەسەر بەردەکە مامەوە و قسەی خۆم لە بەرد نەدا.

بە دیار سەماوە دانیشتووم، لە سەمای ژنە تەنیاکەوە، سەمای ئەو هەموو کچ و کوڕە دەبینم، سەمای ئاو دەبینم، لەو شەوە سەماییە، شەو و ڕووناکی و مرۆڤ و ئاو و ئاواز، ئاوییانە ئاوێتەی یەکترن، بڕوانە، لە سەما ژن و پیاو لاسایی ژنە تەنیاکە دەکەنەوە، ئاواز لاسایی دەکاتەوە، ئاو لاسایی دەکاتەوە، هەموو لە ژنەکەوە، ژنەکە لە هەموانەوە، منیش کەوتمە سەما، ئەو شەوە چ سەمایەکی ئاوی و ژنانەیە! لەپڕ سەما وەستا، ئاواز نوست، ئاو نوست، ژنی بن

داریش، جانتاکەی بە شانی ڕووتیدا دا و ڕۆیشت، لەوێ شتێکی وام بۆ هات:

ژنەکە تۆ
لە جانتایەکی ڕەنگ ئاوی
هەموو دنیات لەگەڵ خۆت برد
بگەڕێوە،
پیاوێکی مەست بە تۆ مەست، لێرەیە، لە بیرت کرد.

## تێلێ دەریا کەرت دەکات

با سەرێ لە سنوور بدەین، سنووری ئەو وڵاتەی بە قسەی پیرێک، هێندە خوێنی گورجستانییانی ڕشتووە، ئەگەر ئەو هەموو خوێنە بڕژێتە دەریای ڕەشەوە، دەبێتە دەریای سوور، وا دەڕۆین بەرەو سنوور، من کەوتوومەتە لای دەریاوە، ترومبێل هێواش بەپێی جەنگاوەرێکی دۆڕاو ڕێ دەبڕێ، جامەکەم کردووەتەوە، بای دەریا شێدارە، سنگم بۆی کردووەتەوە، دەریا دوور دەکەوێتەوە، نزیک دەبێتەوە، بزر دەبێ، بە دیار دەکەوێتەوە، ئەو ڕێیە سنوورییە دەڵێی گەمەی چاوشلکانێمان فێر دەکات.

لە گۆڕاییەکی گەورە بە دەستی لای من، دەستی دەریا، دەریا تەواوێک خۆی لێمان دوور خستووەتەوە، دادوەری بەرێ گوتی:

ببینن، ئەوە کۆنە سەربازخانەیە، هی سوپای سوور، سوپای سۆڤیەت.

ئاخی بۆ کەلاوەکان هەڵکێشا، جوێنێکی سیاسییانەی بۆ گورپاچۆڤ هەڵدا، گوتم:

سۆڤیەت ئەوە دێنێ تۆ...

گوتی:

بەڵێ، بۆ من، بۆ زۆری وەک من بەڵێ.

گوتم:

ئەگەر بکەویە نێوان ستالین و گورباچۆڤ، چی دەکەیت؟

گوتی:

لە ستالین هەڵدێم و ڕاوی گورباچۆڤ دەنێم.

گوتم:

ئەگەر لە ڕێ تووشی لینین بووی؟

گوتی:

بێ سێ و دوو خۆم دەخەمە باوەشیەوە.

لە سەرتر دەریا نزیک کەوتەوە، بە دەستی چیا، بە دەستی شوفێر، کۆنە قەڵاتێک دەرکەوت، چووینە ناوی، دەڵێن تەمەنی چەندان سەدەیە، گورجییەکان لێرە شەڕی عەرەب، تورک، عەجەمیان کردووە، لەوێ مۆزەخانەیەکی گچکە هەیە، هەندێ نووسین هەڵواسراون، کۆنی و دیرۆکی قەڵات دەگێڕنەوە.

گەڕاین، قەڵات پڕ لە ژن و پیاوە، سەرم بەسەر بیرە ئاوەکاندا دادەگرت، سەرکەوتمە سەر دیوارە بڵند و پانوپۆڕەکان، دیوارەکان لە هەندێ جێ تەسک دەبوونەوە، کەم کەس دەیوێرا خۆ لێ بدا، بەڵام من لە بزنەوە فێر بووبووم، نەدەترسام، لە جێیەک لەو جێیانە چوار پێنج ژن عاسێ بووبوون، سەرەتا وا تێگەیشتبوون منیش بە دەردی ئەوان چوومە، بەڵام کە دیتیان بە سانایی پەڕیمەوە، داوای یارمەتییان کرد، یەک یەک دەستیانم گرت و پەڕاندمنەوە، بە زمانی خۆیان، بە ئاماژە سوپاسیان کردم.

ناو قەڵات هەزار کون و قوژبنی هەیە، ئەگەر دۆستێک، یارێکت لە دەست بێ، هەرچی بتەوێ دوور لە چاوان

دەیکەیت، لە هاتنەدەرێ، هاوڕێی سەر هەورێ بە پێکەنینەوە گوتی:

چ دەستکەوتت نەبوو؟

گوتم:

با، دەستی چەند کچ و ژنێکم گوشی! ئەدی تۆ؟

گوتی:

چ نەبوو، تەنها دوو ماچ.

ئێستا لەسەر سنوورین، سنووری وشکانی و ئاوی، من یەکەم جارمە لە نزیکەوە سنووری ئاوی ببینم، سنووری وشکایی کۆمەڵێک پۆلیس دەیپارێزن، سنووری ئاوی تێلێک لێرەوە لە سنگێک گرێ دراوە، لە ناو دەریایش نازانم لە چی گیر بووە، لەوێ لە بن تێلی سنوور خۆم هەڵدایە دەریای ڕەش، هەبوو دەیویست لە بن تێلەوە، لە بن ئاوەوە سنوور ببڕێ، بەڵام پۆلیس لە وشکانییەوە، بە فیرفیرە ئاگاداری دەکردەوە، هێڵ نەبەزێنێ، ئەو تێلە دەریای کردبووە دوور کەرت، دوو کەرتی لێکدی دوور تێلی ئاگر لە نێوانیانە، منیش خولیای بەزاندن هاتە سەرم، لە تێلی ئاگر نزیک بوومەوە، هێشتا پۆلیس فیرەی لێ نەدابوو، دادوەری بەرێ هاواری کرد:

کوڕۆ، بزڤرە، دێ بچین.

لە گەڕانەوە، بە دەستی چیا، تاڤگەیەک هەیە لە چ تاڤگان ناچێ، تاڤگە بۆ تەماشاکردن نییە، بۆ ئەوە نییە لە نزیکیەوە ڕاوەستی و چەند وێنەیەک بگریت، نا، جێی ڕووتبوونەوەیە، تێکەڵبوونە، سەمایە، منیش چوومە بەر تاڤگە، کچ و کوڕێک لە بن تاڤگە سەما دەکەن، دەڵێی لە تاڤگەوە هاتوون، یەک لە

یەک جوانترن، حەزم دەکرد لە بن تاڤگە بمێنمەوە و بۆ هەمیشە بە دیار سەمای تاڤگەوە بم.

لە هاتنەوە، لە پێش چێشخانەیەک تووشی ئەو پیرە بووین کە ڕقی دنیای لە تورک دەبووەوە و ڕستە تووڕەکەی هاویشت، دادوەری بەریی بە پێکەنینەوە بۆی کردینە کوردی:

ئاقارت بەسەر ئاقاری شەیتانەوە بێت، بەسەر ئاگر و دۆزەخەوە بێت، نە بەسەر ئاقاری ترکانەوە.

گوتم:

پێی بڵێ بۆ وا ڕقی لە تورکە؟

گوتی:

برا، خوبیایە، کورد چەوا پرسیاری هۆسا دەکات!

وا بوو، نەدەبوو بپرسم، ئەو پیرە چەند بە باپیرم دەچوو، ئەو باپیرەی هێندەی داوی سەری، ڕستەی دژەتورکی هەبوو، ڕستەیێ لەو ڕستانە هاتە سەر زارم، بیلێم و بلێمە دادوەری بەریی بۆ پیرەکەی بلێتەوە، نازانم بۆ نەمگوت:

چا نەبوو خودا بە ترکی نەیهێنامە دنیا!

## ماینی ئاوی

دەریانەدیتەم و لێی تێر نابم، هاوڕێی سەر هەوری دەڵێ:
خۆزی بۆ چەند ساتێ دەبوومە مراوی.
من گوتم:
خۆزیا بۆ هەمیشە دەبوومە ئەسپی ئاوی.
ئەوەی من دیتم، بابیشم لەو تەمەنە دیتبای، خۆزگەی دەخواست ببێتە ئەسپی ئاوی، ئەوەی دیتم، یەشار کەمالیش ناتوانێ لە وشەدا نیشانی بداتەوە، قاڵە مەڕەیش بە شمشاڵ بیگێڕێتەوە، قەرەنی جەمیلیش لە تابلۆیەک نزیک لە خۆی بیهێنێتەوە.
بە دیار دەریاوە، یان نیوەت لە ئاوێ و نیوەت لە دەرێ، ناوە ناوە شەپۆل دات بنێتەوە و هەڵت بگرێ، دەپرسم چ خۆشە بیخەیتە زارتەوە؟
هاوڕێی سەر هەورێ کە تەنها پێیەکانی لە ناو ئاوین، دەڵێ:
چ خۆش نییە! ئەو بەردە جوانانەیش دەخورێن و خۆشن.
من دەڵێم:
وایە، بەڵام هیچ شتێک ناگاتە ئەو دوو شتەی دەستم.

گەنمەشـــامییەک کە هێشـــتا ســـارد نەبـــووەتەوە، بە دەســـتێکمەوە و بیرەکـــی گـــورجیش بە دەســـتێکەوە، نـــاوێرم دەستمیان لێ بەر بدەم، شـەپۆل دەیانبات، دەستەکانم بڵند ڕاگرتوون، لە ناو ئاوێ گەنمەشامی مەزەیەکە تاکی نییە، من دەڵێم:

خودایە، نەیبڕی، خودایە چکی نەکەی.

ئەو دەڵێ:

نایبڕێ، دەریا چک بکات، بیرە چک ناکات.

من دەڵێم:

وەرە دەریای ڕەشەوە، ڕەنگە ئەوە دوا دیتن بێ.

ئەو دەڵێ:

دەو کەنار چێژی خۆی هەیە.

دەریـای ڕەش پڕە لە لەشـولاری سـپی، سـوور، قـاوەیی، ڕشـتارە، ڕەش... نێـر و مـێ، لە تەمەنـی دوو سـاڵییەوە بـۆ سەرووی هەشتا، تۆ بڵێ سەد، ئەوەتا بە تەنیشـتمەوە ژن و پیـاوێ منـداڵێکی دوو سـاڵە فێـرە مەلەوانـی دەکەن، دەبـێ چ مراوییەکـی لـێ دەرچـێ، پیـرێ بە کـۆخە کـۆخە و لارەلار گەیشـتە دەو دەریـا، کەچـی لە نـاو ئـاوێ دەڵێـی مارماسـییە، ئەو ژنە، ئەو ژنە منـــی کوشـــتووە، دەمـــێکە لە نـــاو ئـــاوێ ڕاوەسـتاوە، لە بـن ڕانـی بـۆ سـەرێ دیـارە، دیـارە مەلەوانـی نـــازانێ، باشـــە ئەوە لە شـــێوە دیـــارە گـــورجییە، چـــۆنە مەلە نازانێ، ئاخر دادوەری بەرێ، دەڵێ:

گـــورجی نیـــیە، مەلە نەزانـــێ، بـــا هەمـــوو تەمەنیشـــی لە بڵندایی چیای قاف بەسەر بردبێ.

ئەدی ئەو ژنە شۆخوشـــەنگە بـــۆ نـــازانێ، دەســـتەکانی دەگەیەنێـتە ئـاو و سـنگ و بەر سـنگ و سـەر شـانی تەڕ

دەکات، ئێ ئەوە نیشانەی خۆ بە ئاودا دانە، بەڵام ئەوە بوو بە چارەگێک خۆی پێدا نەداوە، نا، نازانێ، هەندێ لێی چوومە پێش، بە ئاماژە پێیم گوت:

دەستت بێنە، فێرت دەکەم.

پێکەنیی و بە ئاماژە گوتی:

سوپاس، پێویست ناکات.

بە پێکەنینەوە هەندێ قسەی کرد، هیچ تێنەگەیشتم، بەڵام بە قسەی ناسک و خۆش دەچوون، بە مەلە بە دەوریدا دەسووڕامەوە، ئەو جار جارە تیچاوێکی دەدامێ و بزەیەکی شیرینی دەکرد، هێند شیرین، دەریای ڕەشی لە زارم شیرین دەکرد، زانیم تێناگات، بەڵام هەر پێم خۆش بوو بڵێم:

حەزت دەکرد هێندەی من مەلە بزانی، وا نییە؟!

دەتگوت تێگەیشت، پتر پێکەنیی و بە ئاماژەی سەر گوتی:

وایە، وایە.

هاتمەوە دەو کەنار و نێو بیرەیەکم هەڵدا و گوتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

تۆ جوانیی ئەوهات دیوە؟

گوتی:

جوان زۆرن، ئێمە کەممان دیوە.

گوتم:

بەڵام جوانی ئەوها مەگەر بەس لە گورجستان، لەوێیش لە ناو دەریای ڕەش، لەوێیش ئەوەی وا ڕاوەستاوە و مەلە نازانێ، هەبێ...

چوومەوە نزیک شاجوانی گورجستانێ، زۆر حەزم چووە پرچی کە لە پشتەوە لوولی دابوو، بەستبووی،

پێدەچوو ئەگەر بەری بداتەوە، بگاتە خوار سمتی، چ سمت!
لە ناو دەریای ڕەش تووشی بەڵایەکی ڕەشمان نەکات باشە.

لەپڕ، زۆر لەپڕ، ژنە بزر بوو، دەریا بردی؟! کوا؟ خۆ ئێمە لە تەنکاوی ڕاوەستابووین، چ زوو دیار نەما، زۆر ترسام، شڵەژام، دەور و پشتی خۆم گەڕام، ژنەم نەدیتەوە، گوێم لە هاوڕێی سەر هەوریبە دەڵێ:

بیبینە دەڵێی ماینی ئاوییە.

ئای! ئەوە هەوە، ڕۆیی، بە مەلە بەرەو قووڵایی دەریا ڕۆیی، گەیشتە نزیک سنووری مەلە، ئەو جێیەی ئیدی بۆت نییە بیبەزێنی، لەوێوە تخووبی بەلەم و کەشتییەکان دەست پێ دەکات، گەڕاوە، هەر بە ڕاستی دەڵێی ماینی ئاوییە و هەر ئەوەتا بزیی دیارە، پاش کەمێک بە باسکەمەلە بەرەو قووڵایی، ئەو جارە کوڕێکیش وەک ئەسپی ئاوی کەوتە دوای، پێدەچوو دۆستی بێت، ئای لەو ساتە چەند حەزم دەکرد ببمە ئەسپی ئاوی و لە ناو دەریای ڕەش بکەومە دوای ماینی ئاوی.

## له شەوان مەستتر

شەو داهات، ڕۆژ چوو، حەیف ئەشکەفتە ئاوییەکەمان لە دەست چوو، ئاخر سبەی زوو دەبێ بگەڕێینەوە تبلیس و دووسبەی بگەینەوە هەولێر، دادوەری بەرێ گوتی:

ئەگەر ئەشکەوتە ئاوییەکە نەبینن، وای دانێن گورجستانتان نەدیوە.

هاوڕێی سەر هەورێ دەڵێ:

من دەریای ڕەشم بینی، واتە هەموو دنیام دیت.

ئیدی دەریا نەیهێشت بگەینە ئەشکەفتەکە، ئەوشەو زۆر ماندووم، دەریا ماندووی کردووم، کۆڵانەکانی باتوومی ماندوویان کردووم، مەستی ماندووی کردووم، دەبێت زوو بنووم و زوو هەستم و بڕۆین، لێ پێشەوەی بنووم، هەر دەبێ هەندێ وێنەی ئەو دوو سێ شەو و ڕۆژەی دەریا و کۆڵانەکان بگێڕمەوە:

## پەیکەری جوانی

پەیکەرێ هەیە لەسەر دەریا، درەنگ زانیم بەین نا بەینێ شێوەی خۆی دەگۆڕێ، ئێوارەی یەکەم کە وێنەیم گرت، ژن و پیاوێک بوون هەناسەیان دەگەیشتە یەکتر، ڕۆژی دواتر، ئای ئەوە چییە! تەواوێک لێکدی دوور کەوتوونەتەوە، لە وێنەیەکی دی هەمان پەیکەر، ژن و پیاوەکە وەک بڵێی چوونەتە ناو یەکترەوە، کەس نازانێ دوو کەسن، بەڵام تێگەیشتم لەو سیلەوە وا خۆ دەنوێنێ، دەنا دوو پێ نێوانیانە.

چ بزانم پەیکەر جووڵەدارە، هێواش هێواش بەپێی مێروولە، لە مێروولەیش هێواشتر لە ڕۆیشتنە، لە جووڵەیە، جووڵەیەک پڕ لە ناسکی و جوانی، هەبێ و نەبێ ئەو کچ و کوڕە لە سەردەمی بەرێ، ئەویندار بوونە، بزانە چ بەکرۆکەیێ بە دەردی مەم و زینێ بردوون و بە یەک نەگەیشتوون.

## پێڵاوێک پێکەنین

لەو سەر جادەیەی بە کەنار دەریای ڕەشەوەیە، زۆر شت هەن هێی ئەوەن وێنەیان بگری و وێنەیان پێوە بگری، لەوانە چوونەناو پێڵاو هەیە؛ جووتێ پێڵاوی گەورە، نازانم لە چی چنراوە، خوریی بزنە مەرەزی پێدەشتەکانە؟ پێستی ڕێویی کێوی قافە؟ چەمەنتۆیە، گەچە، چییە؟! هەر چی بێ، جووتێ پێڵاوە و هێندەی بەژنی خۆت درێژە.

پێڵاوی دێوە، لە دەو جادە دانراوە، پێیەکانت دەخەیتە ناوی و وێنەیەکی پێوە دەگری و جوانە، من وێنەیەکم بەو پێڵاوەوە هەیە، دوای من هاوڕێی سەر هەورێ چوو، هەر وای زانی پێڵاو دەکڕێ، پێڵاوەکانی خۆی داکەند و پێیەکانی خستە ناو پێڵاوەکانەوە، من لەبەر پێکەنین نەمدەتوانی وێنەی بگرم، ژنێک کە لە نزیک پێڵاوەکان گەنمەشامیی دەفرۆشت، دیتی بەپێی پەتی چووەتە ناو پێڵاوەکان، پێکەنیی، پێکەنیی، هەر پێکەنیی، لەسەر پشت کەوت، ئاخر شتی وای نەدیتبوو، هاوڕێی سەر هەورێ کە پێکەوت چیی کردووە، لە ژنە گورجییەکە پتر پێکەنیی.

## دیتنەوە

لەسەر دەرگای کەلاوەیەک دیتمەوە، گەشتیار بە دانیشتن گەشتی خەسارە، بۆ دانیشتن نەهاتووین، با دانیشی، ئێمە دانانیشین، شەو درەنگە، لە کافتریاکەی سەر دەریا قاوەیەکمان خواردەوە، هاتینەوە بن دیواری مێوانخانەی شیراتۆن، دەڵێن لە مێوانخانە هەرە خۆشەکانە، خەرجیی یەک شەوی بەقەد خەرجیی هەموو گەشتەکەی منە، لەوێوە هاتینەوە ناو گەڕەکە کەلاوەکانی باتوومی. کەلاوە چێژی تایبەتی خۆی هەیە، دوا ماچەکان دەکەونە ئەوێوە، دڵدارەکان کاتێ دڵبەرەکانیان دێننەوە ماڵێ، لەسەر دەرگا بە ماچێکی قووڵ مالاوایی دەکەن، تا شەو درەنگان بەو کۆلانانەدا نەگەڕێی نازانی ئەو جوانانەی دەڵێی لە ئاسمانەوە دابەزیونەتە سەر دەریا، لەو کەلاوە تاریکانە دەژین، دیتمەوە، لەسەر دەرگای کەلاوەیەکی تاریک دیتمەوە، گوتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

ئەوە کچەکەیە، ماینی ئاوی.

گوتی:

زۆر کەس بە یەک دەچن، بەس وابزانم هەوە.

هەو بوو، بە ماچێ مالاوایی لە دڵدارەکەی کرد، وای لەو ماچە!

## بزربوون

هەر جارەی، هەر شـەوەی لە لایەکەوە بەرەو ڤیرۆنـای میوانخـانە دەهـاتینەوە، هەمـوو شـەوەکانیش بـزر دەبـووین، چەنـد کۆلانیـک بە هەڵەدا دەچـووین، دوای مانـدووبوونێکی زۆر بە سەرەکۆلانی ڤیرۆنا دەکەوتینەوە، بەلام بزربوون لە باتوومی هاوڕێی سەر هەوری گۆتەنی:

بە دەست هەموو کەس ناکەوێت.

ئـاخر لە هەر بزربـوونی، تـابلۆیەکی جـوان، وێنەیەکـی جـوانی شـارت دەدیـت، هەرچەنـدە زۆر لە کۆلانەکـان لە درەنگانی شـەودا تاریک بـوون، بەلام دیمەنەکان جۆرێک لە درەوشانەوەیان تێدا بوو، درەوشانەوەیەکی کۆن، زۆر کۆن، باتوومی هەر ئەوە نییە کە گووگڵ نیشانت دەدا، میوانخانەی نازانم چەند نهۆمی و چەند ئەستێرەیی، نـا، بـاتوومیی کۆن هەر کۆنە، کام خـانووی تەماشـای دەکەیت، هیی سـەردەمی لینـین و سـتالینە، کەلاوەیە، بـاتوومی گەشـتیاری، کەلاوەیە ئەو شارەی دنیـا ڕووی تێکردووە، ئەگەر دەریـای نەدەبوو، کـێ ڕووی تێـدەکرد، جارێـک بە تەنـێ و مەسـتانە بەرەو میوانخـانە هـاتمەوە، مانـدوو بـووم، هەر نەمـدیتەوە، لەو درەنگـانی شـەوە و لەو کۆلانـانە تەکسییش نیـیە، چ بـکەم،

تەلەفۆن بۆ دادوەری بەرێ دەکەم جوان نییە، ئێ، هەر دەبێ لە کەسێ بپرسم، فرۆشگەیەکی گچکە خاوەنەکەی دەیویست دای بخات، بە قسە و ئاماژە لێیم پرسی:

میوانخانەی ڤێرۆنا لە کوێیە؟

ژنە بە قسە گوتی:

لۆدی، لۆدی.

بە ئاماژەیش:

دەڵێی زۆرت خواردووەتەوە، ئەدی ئەوە ڤێرۆنا نییە!

ئای، خۆ من لە پێش دەرگای ڤێرۆنام و ئەوەیش ژنە مەیفرۆشەکەیە.

## پلکە گورجیم دیتەوە

بەیانی دابوو و نەدابوو، هێشتا باتوومی هەر لە خەودا بوو، برادەرەکەم کەمێک پێش من هەستابوو، هەستام، لە گەراجێ ڕۆژ گزنگی دا، چەند حەزم دەکرد گزنگی سەر دەریای ڕەش ببینم، نەمدیت، حەیف، ڕۆژ لەسەر دەریاوە نا، بەسەر دەریادا هەڵدێ، دەریا لە ڕۆژاوایە، بۆیە هەر زەردەپەڕی دەریاییم دیت، مالاوا دەریای ڕەش، ماڵت هەر ڕەنگاوڕەنگ و هەوری و زەردەپەڕی و پڕ لە ژن بێت، سوپاس بۆ میوانداریت، سێ شەو لە باوەشتدا کپ خەوتم، سێ شەوی پڕ لە نمە، لەو سێ شەوە تەنها سێ گلەییم هەیە، دوانیان نازانم لە کێ، یەکیان لە خۆم:

دەمەوعەسرانێک لە نزیک پێلاوەکان، ئەو پێلاوانەی لە پێلاوی دێو دەچوون، بە مەستی دەڕۆیشتم، لەپڕ پیاوێک نازانم، پۆلیس بوو، ئاسایش، یان کەسێکی وەک خۆم ئاسایی، پیلمی گرت و بە نەرمی دوو سێ شەقاو لەو هێڵەی دوور خستمەوە کە گرتبوومە بەر و بە موو لێم لا نەدەدا، قسەیەکی کرد، نەمزانی چ دەڵێ، گوتم:

چییە! بۆ وا دەکەیت؟

وەڵامی نەدایەوە، باش بوو زۆر بە نەرمیم گرتبوو، دەنا تووشی شەڕێک دەبووم.

لەسەر سنووری تورکان، شانم بە شانی کوڕێک کەوت، ئاوڕی دایەوە و بە تورکی جوێنێکی مزری پێ دام، منیش دەستبەجێ بە کوردی جوێنێکی مزرترم پێ دایەوە، جوێنێکی تورکمانیم بیر کەوتەوە، کاتی خۆی باپیرم فێری کردبووم، بەڵام تا بۆیم هاویشت باش بوو دوور کەوتبووەوە و نەیبیست، دەنا شەڕی کورد و تورک دەگەیشتە خاکی گورجستانیش.

شەو دەرنگانێ، لە نزیک ئەو پەیکەرەی هەر دەمەی بە شێوەیەک خۆی نیشانمان دەدا، بە تەنێ پیاسەم دەکرد، دیتم کچێک هاتە تەنیشتم، شانی گەیاندە شانم، بە ئینگلیزی دەستی بە قسە کرد، هێندەی تێگەیشتم، بە سەد و پەنجا لاری مێوانداریی ماڵی خۆیم دەکات، گوتم:

زۆرە، بە سەد لاری نابێ؟

ڕازی بوو، بەڵام من پەژیوان بوومەوە، ڕاستی من حەزم دەکرد شەوێک ببمە مێوانی ژنە گورجییەک، بەڵام نەدەبوو، نەدەبوو لەبەر سێ هۆ، هۆی یەکەم و دووەم لێگەڕێ، چونکی زەحمەتە خوێنەر باوەڕ بێنێ، تەنێ هۆی سێیەم دەڵێم، کە خوێنەر ساناتر باوەڕی پێ دێنێ، دادوەری بەرێ زوو گوتی:

ئاگاداری ژنان بن، لێرە نەخۆشی گەلەک زۆرە.

ببوورە کچەکە، پەژیوان بوومەوە.

وا جێت دەهێڵین، دەریا، لە کەنارت، کەناری بەر شەپۆل، بۆ یادگاری توورەگەیەک بەردی مرواریم هەڵبژارد، هەر بەردەی لە ڕەنگ و شێوەیەک، من لەمێژە بیستوومە

جـــوانترین دیـــاریی دەریـــا، بەردە، منـــیش هەر بەردم هەڵگرتەوە.

لە پاسێکین زۆر لەو پاسە دەچێ کە پێی هاتین، پاس چۆڵە، شەش حەفت سەرنشینی تێدایە، بە تەنێ دانیشتووم، لە ڕێیێ سواربوون و دابەزین هەیە، لە نزیک ئەو شوێنەی هێڵی شەمەندەفەر جادە دەبڕێ، تۆ بڵێ ئاقاری شێتە ماچهاوێژەکە، ژنێک سەر کەوت، وێنای دەکەم، لە تەنیشتم دانیشت، درەنگ ناسیمەوە! دەزانن لە کەنگێوە نەمدیتووە، گۆتمە خۆم، خۆمی لە خۆم ترازاو:

ئەوە پلکە گورجییە.

گوتی:

لەمێژە لە دووی دەگەڕێی، دیتتەوە؟

پلکە گورجی پوورزای نەنکمە، هەر بە منداڵی هەستم کرد سیمای لە سیمای ژنانی گەڕەک ناچێ، لە چ ژنان ناچێ، بیستبوویشم لە نەنکەوە دەگاتەوە عرووسان، تا لێرە نەمدیتەوە نەمزانی پلکە گورجیم گورجییە، وەک خۆیەتی، هیچ نەگۆڕاوە، بەخێرهاتنم کرد، بە زمانێک وەڵامی دایەوە تێینەگەیشتم، پلکە گورجی زمانی کوردیی لە بیر چووەتەوە، پلکە گورجی نامناسێتەوە! لە ئاقاری گۆری ژنە گورجی دابەزیی، ڕۆیشتنیشی هەر لە پلکە گورجی دەچوو، جامەکەم لا دا، وێنەیەکی لە دواوەی ژنەکەم گرت، لە بنی نووسیم:

پلکە گورجی لە ئاقاری گۆری.

ئەرێ ئەو دوو گورجییە بۆچی هێندە بە یەکتر دەچن! من چیم بەسەر هاتووە، چاوم بۆچی وێنەکان تێکەڵوپێکەڵ دەکات!

وا گەیشتینەوە تبلیس، تبلیسی سەرچاوەی گەرم، دەڵێن وشەی تبلیس ئەو واتایەی هەیە، لە سەدەی پێنجەمە، چەندە، یەکەم بەردی بناغەی تبلیس لە نزیک کانییەک دانراوە کە ئاوی گەرمی لێ هەڵقوڵاوە، هەر بۆیە بەو ناوە ناودێر کراوە.

## پەری لە نزیکەوە

گەشتیار بە دانیشتن کاتی ویرانە، بەڵام ئێمە دانیشتین، ماندوویەتیی لە عەسرێوە تا ڕۆژ لە چیا ئاودیو بوو، ئێمەی لە میوانخانە هێشتەوە، لە پەنجەرەوە ئاوابوونی ڕۆژم دیت، زۆر لەو ڕۆژە دەچوو کە لە چیای قەرەچووخ ئاوا دەبوو، ئەو چیایەی لە پەنجەرەوە دیارە و زەردەپەڕ پەڵەهەورێکی تێکەڵ کردووە، شانی بە قافەوەیە، دوا شەوە ئەو شەو، چ کاتمان نەما، هەر بەشی پیاسەیەکی بازاڕی کۆنی شارین، ئەو بازاڕەی من لێی تێر نابم و قاوە یان بیرەیەکی کۆڵانی ماچان کە کەس لێی تێر نابێت، ئا، هەر بەشی هێندە دەکات، ئەو ئێوارەیە لام نەدایە نانەدێنەکەی باجی حەلاو، چووم خینکالیم خوارد کە لەگەڵ خەجەپووری ناودارترین خۆراکی گورجییانن؛ خەجەپووری هەویرییە و خینکالی بەرازی.

درەنگ گەیشتینەوە میوانخانە، پیاوە ئەرمەنییە شیرینەکە بە ئاماژە و پێکەنینەوە گوتی:

لە باتوومی تێر بوون لە خانمباجی؟!

بە دەنگێک هەر خۆم بیستم:

زۆر زۆر لە سەرمان دەڕژێ!

گوتی:

دوا شەوە، ئەگەر ویستتان، هەیە.

گوتم:

ئەگەر ویستمان، تەلەفۆنت بۆ دەکەم.

ئەرمەنی بە پێکەنینێکی درێژەوە گوتی:

خانمیش پیاوی خۆی دەوێ!

بە دەنگێک خۆیشم نەمبیست، گوتم:

ئێمە پیاوەتیمان لەگەڵ خۆمان نەهێناوە!

ئەرمەنی هیچی نەگوت و چوو.

شەو درەنگە، ماڵنوستانە، خەوم نایێ، چوومە باری میوانخانەکە، لەسەر چۆڵبوونە، شتێکم بانگ کرد، کچێک پێکی بۆم کرد، دەتگوت لە حەبەشەوە هاتووە، هێند شیرین، هێند شیرین، دەتگوت هەنگوینفرۆشە، لە خووە و جێی خۆشی نەبوو، بە دەنگ هێمنم گوتەوە:

ساقیا وا بادەوە وا بادەوە

ڕووی لە لای من کە بە جامی بادەوە

پاش کەمێک کچێکی دی شتێکی هێنا، پێدەچوو لە ئەسکیمۆوە هاتبێ، گوتم:

تۆ خەڵکی کوێی؟

پێکەنی و هیچی نەگوت، چ بڵێ! ئاخر من بە زمانی خۆم پرسیارم لێی کرد. درێژەی نەدەمێ باشترە، با زوو بگەینە پەرییەکە. لەو دانیشتنە تەنیاییە شەو درەنگییە، جگەرەم بە جگەرە پێ دەکرد، یەک شەوی دی لە تبلیس بمێنمەوە، حەفت ساڵم بەلاش دەچێ، دوای حەفت ساڵ لە هێلانی جگەرە بۆی دەگەڕامەوە، لەپڕ، زۆر لەپڕ لە بارانی بەهاری لەپڕتر، لە هاتنی مەستی لەپڕتر، لە فڕینی فەرە قەتێ لەپڕتر،

له دیتنی پەری لەپڕتر، گەیشتە سەر سەرم و داوای ئاگری کرد، سەرم هەڵبڕی، ئەوە چییە! خەونە یان خەیاڵ! کەوتمە ناو لۆکس و مانگەوە، بەو ناوەختە لە کوێوە هەڵبوو! لە کوێوە هەڵهات!

جگەرەکەم بۆی داگیرساند، بە ئامازە، ئامازەی دانیشتنم بۆ کرد، بە ئامازە گوتی:

دەڕۆم، ئێستا دێمەوە.

بە قسە، بەلام تێنەگەیشت، گوتم:

بە ڕاستی دەڕۆیت، بەلام بە درۆیش ناگەڕێیتەوە.

ڕۆیشت، بانگی کچە حەبەشییەکەم کرد، بەلام کچە ئەسکیمۆییەکە هات، گوتم:

تۆ تێکەڵەیەکی لە بەفر و خوێن، ئەوەت زانیوە؟

هیچی نەگوت، چ بڵێ! هیچ تێگەیشت؟! هەندێ لاریم دایێ و گوتم:

بانگی کچە حەبەشییەکەم بۆ بکە.

بانگی نەکرد، ئاخر بانگی کێ بکات، خۆ چ لە من تێنەگەیشت.

من لە هێمنم بیستبوو:

لە ناو کوردان نەبوو پەیمانشکێنی

لە کوێ فێر بووی گوڵم پەیمانشکێنی

ڕەنگە هێمن لە تەمەنی خۆیدا تەنێ لەو پەیمانە بە هەڵەدا چووبێت، ئاخر من دنیایەک پەیمانشکێنیم لە کورد دیتووە، بەلام پەرییە گورجییەکە پەیمانی خۆی بردە سەر، من مەستم، لە مامۆستا بورهان مەستتر، ئەو پیاوەی لە مەستیی خۆی مەزەیەک بە ناوی ویەوە هەیە، بورهانیم مەبەستە.

لە مەستان، لە خۆم، لە پەرییەکەیش مەستترم، بەڵام وێنە وێنە لە چاومە، وردوردرشتت بۆ دەگێڕمەوە، هات پەرییەکەی تبلیس، پەرییەکەی گورجستان لەو شەوە هاوینییە بە کراسێکی تەنکی بەهارییەوە، بە مەستییەک هەر لە خۆی دەهات، هات، پەیمانی نەشکاند و هات، باشە کیژێ، پەریێ ئاسمانی، ئەتو کوو لە بیرت مابوو! پەری! ئەوەتا لەسەر مێزی من دانیشتووەوە و جگەرە دەکێشێ، خودای جوانی ئەو جوانە چییە بەو نیوەشەوە هێناوتە سەر مێزی مەستیی من.

بادەی ئەو شەوە، لە بادەی سەر دنیا نەدەچوو، دنیایش لە دنیا نەدەچوو، گەیشتبوومە سووچێکی بەهەشت، پەری درەنگ لە باڵی دا، بە ئەسپایی هەڵفڕیی، نە دەنگی پێی هات، نە هیی باڵی، نەیهێشت پارەی بادەکەیشی بۆ بدەم، ماڵت ئاوا، ماڵی نیگامت پڕ کرد لە جوانی.

## قاف، ماڵاوا...

بە گزنگی قاف ڕانەگەیشتم، هەتاو کەوتبوو، دانە ڕۆژێکمان لە پێشە، بەشی چ ناکات، پیاسەیەکی درێژی شەقامی درێژی ڕۆستاڤیلی کە لە داستانەشیعر دەچوو، پیاسەیەکی کەناری ڕووباری کورا کە دەتگوت شمشاڵە و با دەیژەنێ، لەوێ لەسەر دیوارێکی کۆن پەرژینێکی کۆنی ئاسنینم دیت، چەکوچ و داسی لەسەر نەخشێنرابوو، من هەر ئەو پاشماوەیەی کۆمەنیستانم لە تبلیسی بەرچاو کەوت، سەردانی پێشانگەیەک کە تابلۆکانی قسەیان دەکرد، دانیشتنێ لە قاوەخانەکەی کۆڵانی ماچان، هەڵگەڕانێ بە سێبەری دایک، ئیدی نێوەڕۆیە، لە پێش نانداینەکەی باجی حەلاوەوە بۆ میوانخانە، شوفێر تەکسی تەنکەڕدینێکی هێشتووەتەوە، بەر سمێڵی هەڵپاچیوە، گۆتمە هاوڕێی سەر هەورێ:

دەڵێی هیی لای خۆمانە!

گوتی:

زۆر پێدەچێ کێ دەڵێ...

کابرا پەنجەی بۆ درێژ کردم و گوتی:

تورک، تورک؟

گوتم:

نا، کوردین.

گوتی:

کرمانج! کرمانجی زانی؟

گوتم:

بەڵێ، دزانم.

گوتی:

ئەز ئازەرم، لێ کرمانجی زانم، من گەلەک برادەرێن کورد هەنە.

لەگەڵ ئەو پیاوە لە هیچ نەگەیشتینە یەک، ئەو دەیگوت:

تورک باشە، چونکە موسڵمانن، گورجی نەباشن چونکێ موسڵمان نین.

گوتم:

وەی چەند باشن!

گوتی:

بەو قسەیە گوناهت دەگاتێ.

باسی نوێژ و ڕۆژووی هێنایە گۆڕێ، کە تێگەیشت بە دڵێ وی قسە ناکەم، قڕوقەپی لێ کرد، دابەزیین و لە هەقی خۆی دوو لاری زیاتری لێ وەرگرتین.

تەکسییەک بە گۆرانیی ناسکی ئەرمەنییەوە، گەیاندینیە فڕۆکەخانە، لە خاڵی پشکنین، جانتای هاوڕێی سەر هەورێ دەتگوت قەلابە بەرد ڕوو دەکات، بەردێ نەبوو، دوو نەبوو... تەق تەق، کابرا وابزانم دەیگوت:

ئەوە چییە، لە ناو فڕۆکە شەڕەبەرد دەکەن!

زۆریـــان گێــڕایەوە و دوو ســێیەکی گچکەیــان دایەوە، وابــزانم بەردەکــانی منیــان نەدیــت، دەنــا دەگەیشــتنە ئەو باوەڕەی ئەو بەردانە بەردی ئاسایی نین و شتێکیان تێدایە!

لە نـــاو فـــڕۆکە نەکەوتیــنە تەنیشـــتی یەکتـــرەوە، لە بەدبەختیی خۆم کەوتمە سەر باڵەکەی، دیتنی دنیای خواری کەمێکی نەبێ، لە دەست چوو، گەنجێ هاتە تەنیشتم، وەک بڵێـی بە قاچـاخ چــووبێتە بەهەشــت و گرتبێتیــان و بە زۆر ڕەوانەی دۆزەخی بکەنەوە، ئەوها هـاتە پێش چاوم، زۆر بە نابەدڵی و بێزاری دانیشت و گوتی:

ئاخر ئێرەیش جێیە!

پێــدەچوو لە خەیــاڵی وای دانابێــت، دەکەوێــتە تەنیشــت ژنێکـی جـوان، تەنیشـتی ئەولایشـی بە پیاوێـک پـڕ بـووەوە، کەوتە نێوان دوو پیاو، بە جارێ قوڕی بە سەر بوو.

لە هەڵفڕیندا، تازە پێمان لە زەوی بووبووەوە، لە جامەوە تبلیس و چیاکانی قـاف جـوان دەرکەوتن، لەو سـاتە شـتێکی وام بۆ هات و نووسیم:

گورجســتان ژنــێکە لە مــرواری، لە کەشــێکی هەمیشـــە بەهـــاری ڕاکشـــاوە، لە کەنـــاری دەریـــای ڕەش پرچـــی کــردووەتەوە، لە پێیــڕا دیــارە هەوڵــی داوە بگــاتە دەریــای قەزوێن نەگەیشتووە، دەستەکانی لە گەردنی چیاکـانی قـاف ئاڵاندووە، لە مەمکەکـانیەوە ڕووبـاری کوڕا بەسـەر ناوکیدا جۆگەلە دەبەستێ، بە نـاو هەردوو ڕانـی ڕوونیـدا لە قەزوێن دەکاتەوە...

نووسـینی نـاو فڕۆکە، نووسـین لە ئاسـمانێ، ئەوەیشـم نووسی:

لەسەر زەوییەوە زۆرم لەبارەی ئاسمانەوە نووسی، با لە ئاسمانیشەوە چەند دێڕێک لەبارەی زەوییەوە بنووسم.

هەر نووسین نا، لە ئاسمانی دەستیشم بە ئاو گەیاند، دێتەوە بیرم، باپیرم دەیگوت:

لە ناو فڕۆکە چوومە سەر پیشاوێ.

ئێمەی منداڵ، تا درەنگیش دەمانگوت، داخوا لە کوێ کەوتووەتەوە؟ دەموچاوی کێی سواخ داوە!

ماڵاوا قاف، ماڵاوا گورجستان، بەسەر هەور و ناو هەوری بن هەوردا هاتینەوە، لە هاتنەوەیش باپیرم لەگەڵم بوو، پێکەوە لە ئاسمان، لە بۆشایی، لە ناو ئەستێران دەسووڕاینەوە، باپیرم دەیگوت:

لە گەڕانەوە، هەستم دەکرد، بە باڵی خۆم دەفڕم.

ڕستە ترسناکەکەی کوڕەکەی تەنیشتم نەبا، کە ناوە ناوە دەیگوتەوە، من بە باڵی خۆم فڕیبووم و نەدەهاتمەوە ناو فڕۆکە، کوڕە دەیگوت:

فڕۆکە شتێکی لێ بێ، ئێمە کە لە سەر باڵەکەین، لە پێش هەموان بەرەو قیامەت دەفڕین.

مردنی زاری ئەو کوڕە، مردنی بە بیر دەهێنامەوە، لە خەیاڵی ناسکی ئاسمانییانەی دەکردم، کەمێک ترس دەکەوتە دڵمەوە، خۆ جارێک فڕۆکە دەنگێکی لێوە هات، هەر زۆر ترسام و گوتم، ڕەنگە ئەو کوڕە دڵی تریواندبێتی و لە ئاسمان بمرین، بەڵام ترس زوو دەڕەوییەوە، هێندە لە جوانی و خەیاڵ دانەدەبڕام، دەچوومەوە ناو هەور و لای باپیرم، تێکەڵی ئەوێ دەبوومەوە، باپیرم دەیگوت:

ئەو برادەرەی لەگەڵم هاتە حەجێ، ناوی عەبدوللا بوو، بەڵام هێندەی باسی سەر هەور و ناو هەوری دەکرد، من

ناوم نا حاجیی سەر هەوریێ، ئیدی تا مردیش زۆر کەس هەر بە حاجیی سەر هەوریێ دەیانناسییەوە.

منیش هەر لەوەوە ناوم لە برادەرەکەم نا، هاوڕێی سەر هەوریێ، تۆ لەو ڕێکەوتە بڕوانە، هاوڕێی سەر هەورێی منیش هەمان ناوی برادەرەکەی باپیرمی هەبوو.

دوای سەعاتێک و حەفت خولەک مانەوە بە ئاسمانەوە، لە هەولێر نیشتینەوە؛ نیشتنەوەیەکی خەوناوی. خەونێکی شەوانی منداڵیم بیر کەوتەوە... لەو خەونەدا کەوتمە دوای هەوێردەیێ، بە دوایدا چوومە ئاسمان، نەمگرت، بزر بوو، نیشتمەوە؛ ئەو نیشتنەوەیە زۆر لە نیشتنەوەی ناو خەونەکە دەچوو.

**تبلیس - هەولێر**
**٢٠١٢**

بێ کاڵەی ئاسنین بەسەر کێوی قاف کەوتم، ڕۆژ لەسەر ئاوابوونە، ڕەنگی دنیا چ ڕەنگە؟ ئەگەر خۆم منداڵ بکەمەوە، دەڵێم ڕەنگی ئەوانی دی و خەزێمە و بەیبوونە، دێتە بیرم بە منداڵی لە بەهاری دۆڵی دڵۆپەی بن هەولێرێ لە هەر گوڵەی گوڵێکم دەچنی، بەلام لە گوڵی خەزێمە و حاجیلە (بەیبوون) چەند گوڵێک، چەپکەگوڵێکی ڕەنگاوڕەنگ دەردەچوو کە ڕەنگی حاجیلە و خەزێمەی تێدا زاڵ بوون، ئەو ئێوارەیە کەمێک لەو چەپکەگوڵە منداڵییە دەچوو، جیاوازییەکە لە دیدی عەردی و ئاسمانییەوەیە.

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

Sardam Printing & Publishing House

2020